

## بۆ چاوكاڵەكەی بانگ

وەی قەزای چاوێكی تۆ لەم بانگ و عەكسانە كەوێ

من لە چاو حاڵیم دەزانم چاوی تۆ چی لێم دەوێ

چاوی تۆ هێند مەستە هوشیاری نەهێشت لەم بانگەدا

خاڵ و میلت ڕشتووە هەر عەینی سەرباڵی كەوێ

هێند خەواڵوون و كەچی وا خەونی عالەمیان زڕاند

من دەزانم چاوی تۆ بۆ هێندە لێڵن بۆ خەوێ

هەر ئەمن شەیدای ئەوین و حوسنی ڕەفتارت نەبووم

هەر كەسێ گەر دێت و دەتبینێ وەكوو من ناسرەوێ

گەر دڵت وەك دەنگی نەرمت با لە حاندی عاشقان

شێت دەبوون دەتزانی ئیدی عاقڵێ گیر ناكەوێ

چاكە شیعرم بووەتە سەرمایە و نیازت پێی هەیە

خۆ دەنا گەنجی وشەم گشت ون دەبوون لێرە و لەوێ

گەر سەریشت لێم بوێ بۆ بەردەبازی ڕێگەكەت

دەیخەمە ژێر پێت عەزیزم شەرتە بێ تۆ نامەوێ

كەس وەكوو «ئاسۆ» بە داوی بسكی تۆ پێوە نەبوو

ڕەسمی ڕوخساری لەتیفت بۆتە مەشقم هەر شەوێ

بۆكان، ١٣٨٢/٤/١٨







# بۆ لاقه دەوڵەتیەکەی مامۆستا کەماڵ

ئەوێ ڕۆژێ کە بابادەم لە سەر ئەم خاکە پێی دانا
لە تووبا بێبەش و گریا بە ڕووی داو و تەڵەی دانا
لە بۆ ماڵ و مەقامێ وێڵ نەبوو بۆ خاکی خۆی گریا
لەسەر خاکی بەهەشتی خۆتە کاکم تۆش کە پێت دانا
کە ماڵت بۆ نەهێڵن لانشینی چەشنی زیندانی
ئەتۆ عەینی کەماڵی کوا غەمت بگرێی لە زیندانا
ژیان ئەمڕۆ عەلیلە، دڵ نەخۆشە بێت وخۆشی کەی
وەکوو جەڕڕاحی موعتەللاتە پێت دەکوتین لە دەرسانا
ئەتۆ نابێ بەوەی شەل بیتەوە تا کاکە تۆ شەل نیت
ئەتۆ قاڵ بووی لە بۆتەی حەقپەرستی خاکی کوردانا
هەتا بارانی ڕەحمەت داینەکا هەر بەفر و زستانە
بەڵام کێ دیویە تا سەر، ساڵ بمێنێ هەر لە زستانا؟
بەرێزم چاوەکەی چاوم مەترسێ ڕوونە «ئاسۆ»کەت
ئەگەر سەد هەوری ڕەش بگرن بەری تیشکت لە ئاسمانا

ڕێگای مەهاباد – بۆکان ۱۳۷۸/٦/۱





# چاوبڕکێ

باسی قەیتان بۆ دەکەم هەرتاکوو لیوی تۆ هەبێ

باسی پەرچەم بۆ دەکەم هەرتاکوو زولفی لۆ هەبێ

خوا شوکور دیم و نەمردم پەرچەمی ئەم میللەتەش

کوا ژیانە ژینی ئەو خاکەی لەوێ نامۆ هەبێ

چاوی تۆ فێرم دەکا چۆن جوان ببینم زێدەکەم

شەرتی پاک پەیمانی چاوە با هەزار ناتۆ هەبێ

من برۆی تۆم تاقی میحرابی دڵە بۆ نوێژەکەم

چاوی تۆ ئەستێرەمە با سەد تەرازوو و کۆ هەبێ

ڕووت لە من قەت وەرمەگێڕە من وەکوو ئاوێنە وام

چاو لە چاوی من بڕە و جا گوێت لە جوانی خۆ هەبێ

شەرتە شیعری چاوی تۆ بۆ گشت قەناتێکی بەرم

عالەمێ عاشق بە چاوت کەم ئەگەر بە درۆ نەبێ

بەم چلەی هاوینە ڕوخسارت دەڵەی باغی گوڵە

کوڵمی تۆم پێ سوورترە با سەد گوڵی هێرۆ هەبێ

چاوەکەت کاتێ خەواڵوون زۆر لە گەڵ بێدارترن

گل دەکەن بۆ چاوەبڕکێ شەخسێ وەک «ئاسۆ» هەبێ

ڕێگای مەهاباد – بۆکان، هاوینی ١٣٨٦





# لێم گەڕێ

باخەڵم پڕ شیعری پاراوە ئەگەر غەم لێم گەڕێ
شۆرەت و ناوم بە پووشێ ناوێ گەر زەم لێم گەڕێ
سەر لە سەر ئەستێرە دەسوێ شاهەڵۆی ئاواتەکەم
گەر لەمەولا باسی ڕەنج و شین و ماتەم لێم گەڕێ
کەی وەکوو منداڵ بە بووکی چینی شیعرم ژێر ئەبم
گەر خەیاڵی باغی بەروێ و شەودزی مەم لێم گەڕێ
گۆی زەوی وەک تۆپی کایەی هەستی شیعریمە ئەگەر
لەم وڵاتە جوانەدا کەمبوودی پەرچەم لێم گەڕێ
بۆ ئەوەی تەیری ئەوین هێلانە لای شیعرم بکا
گێژەڵووکەی باڵشکێن هەر تاقە یەک ژەم لێم گەڕێ
من چریکەم ئاشنای گوێی دڵپەژارانی گەلە
بۆ نەیارانم هەیاران! هۆرە ناکەم لێم گەڕێ
با وەکوو پەروانە جێژوانم لە سەر گوڵ بێ منیش
ئەی خەیاڵی هیجرەت و باسی وەلی و شەم لێم گەڕێ
تاکوو «ئاسۆ»م ڕوون دەبێ شەو چاو لە ئەستێران دەکەم
نامهەوێ گوڵزاری تینوو و جامی کەمکەم لێم گەڕێ

بۆکان ۱۳۷۵/٤/۱۲







# ڕەش‌ئەسمەر




لێم گەڕێن من ژیلەمۆی پەروانەیێ سەوداسەرم
تا بەدی کەم نووری عەشقێ ڕۆحەکەم دێتۆ بەرم

بووکی ئازادیم لەگەڵ دێ خۆی دەبێتە ڕێبەرم
بەرهەڵەستی ئاسنینیشم لە سەر ڕێ دابنێن

مستی پۆلام دایدەهێنێ تۆرەمەی ئاسنگەرم
لێم گەڕێن چۆن پێم دەڵێن لای‌لای لەبۆ شەوگار بکەم

من کوڕی شەوقم ڕەواجی نوورە بازاڕی سەرم
شەقڵی ماچی من لە سەر کوڵمی هەتاوا دیارە هەر

دەی چڵۆن بێزم دەهێنێ گەر پەنا بۆ شەو بەرم
من گڵی دڵیان بە ئاوی عیشقە پێژاوم برا

بۆیە هەر ڕەش‌ئەسمەرێ دێ زوو دەبێتە دڵبەرم
سەد کەژاوەی کۆچی یارانم بەڕێ کردوون کەچی

بووکی بن تارای شیعر قەت هەر نەهاتە یاوەرم
تاوەکوو «ئاسۆ»ی خەیاڵی شەوقێ ڕووی تۆم دەرکەوێ

من سەراپا دەبمە گڕ نامێنێ شوێنی سێبەرم

بۆکان ١٣٧٤/٨/٢١





## دوایین وتەی دایە




منالێکی سەربزێو بووم
عاشقی چۆم و دار و کێو بووم
وەک ئێستاش دیارە ڕەشتاڵە
پێخواس و پێخە ئاواڵە
چاوم پشکووت بە شای‌مەردان
خانووی کۆنە، ئاسمانی جوان
بە کۆڵەکەی دووکەڵی ڕەش
هەڵدەچووم تا هەتاوی گەش
لەگەڵ گەڵای تازەی چنار
هەر سەوز دەبووم پایز و بەهار
بە هاڕەی ئاوی سەر شەتاو
عاشقتر دەبووم لە لاولاو
لە گەڵ کاڕەی مێگەلی مەڕ
دەمنایە چاڵ دزێوی و شەڕ
هاوین دەهاتەوە مێگەل
فەرقم دەخست چالاک و شەل
ئەرخەوانسووری جەغەتوو
دەستەخوشکەکەی تەتەهوو
لێویان فێر کردم بە هەڵبەست
داسی قەڵەمیان دامە دەست



خەرمانان بۆ خەرمانلۆغە

کونکون دەبوو دارێن چۆغە

ئێواران ماندوو و تۆزاوی

بە قژی ڕەش و ئاڵۆزکاوی

دەهاتمەوە بەرەو نێو ماڵ

بۆ کایە و بازی سەر هەرزاڵ

تاقە خوشکێک و دوو برا بووین

بە ڕۆح یەک بووین بە لەش جیا بووین

لە باوەش دایکێکی دڵسۆز

بابمان مەلاییکی بێپۆز

دەمانخوێنند دەرسی نیشتمان

ئەم بە لای‌لای ئەو بە قورعان

کاتێ چاو لێڵ دەبوو بۆ خەو

گوێم دەدایە چیرۆکی شەو

شەڕی بانە و کۆلکەسووتان

شۆڕشی حەمەڕەشیدخان

نانی وشک و شۆڕش و چەک

دووری شەڕی بەران و شەک

دەبوونە یەک دژی و خۆیی

ئاوارەیی تیلەکۆیی

هەر بۆ سەر و هەر بۆ سەر چووم









دیسـان گـەورە و گـەورەتر بـووم
مەدرەسـەمان دیـەی خانـە
نێرامـە نێـو قوتابخانـە
دەسـرەیەکی نـا گیرفـانم
دایکـی یـەکجار میهرەبـانم
مـیرزا دەبـێ و قـەت نـادا جـوێن
کـورم دەبێتـە قورعـانخـوێن
خوێنـدنم دەکـرد ئـەژمارە
هـەتا پێـنج سـاڵ بـەم ئاکـارە
غـەریبی بـۆی کـردم سـەما
ئیـدی دەرزم لـەوێ نـەما
ئێسـتاش داخـە و لـە دڵمایـە
دوور لـە دێ لـە بـاب و دایـە
دوور لـە گـوڵی هێـرۆ و لاولاو
دوور لـە هـارەی ئـاوی شـەتاو
دوور لـە مێـزەر و پێـی خـاوس
دوور لـە دەنگـی مەشـکەی گـاوس
دوور لـەو بـاخ و شـاخە زەردە
دوور لـە چـۆمی پلەوبـەردە
بێگانـە بـوو هـەرچی دەمبیسـت
دوور لـە هـەرچی خۆشـم دەویسـت











لە سەر هەر گوێی چۆمێ کوڕێ

لە سەر هەر کانیاوێ چۆڕێ

منداڵیمیان بردۆ لە بیر

ژەکی داکیان لێ کردمە شیر

خورپەیەکە و لە دڵمایە

بەڵام ئاخ هەر دووری دایە

وەرزی ئارەق و تین دەهات

هەتا وەرزی هاوی دەهات

لای قلیچقایە و قاسپەی کەو

دەهاتمەوە داوێنی ئەو

دیسانەوە پاییز دەهات

مۆرەی دڵ ئەو دەم زیز دەهات

کە هەر خشتی وەک ئاوێنە

دەبوا جێ بێڵم ئەو شوێنە

ڕەت نابێ کێ لێی بخوێنێ

جوانی کردگار دەنوێنێ

جێ بێڵم و بکرم دەورە

دەبوا ئەم زانستگا گەورە

سەرکەوتوو بم نەک بە شەلی

تا لە مەکتەبی بووعەلی

بچمە نێو شار وەک پێی تاوس





گوێ نەگرم لە مەشکەی گاوس
بیرم هەر لای جەغەتوو بوو
سەقز هەرچەند پێشکەوتوو بوو
نەدەبووە دەستاوی دایە
چی چێشتی خۆشی تێدایە
کە بەقەد ڕۆحم شیرینە
وردە وردە ئەم ئەوینە
کردمیە غەریبی شاران
لای دا لە سەر ڕەیلی جاران
ورمێ و تەورێز و سەبزەوار
سەقز، بۆکان، سنە ئەمجار
چۆن بۆ خوێندن بیمە سۆنە
فێریان کردم ئەوین چۆنە
بۆ رووحم بینە سەرمایە
عیشقی نیشتمان و دایە
هەتا بوومە شاعیری کورد
سی و شەش پاییزم وا ڕابورد
بە ڕەنگی زەرد و تامی تاڵ
بەڵام ئەم پاییزەی ئەمساڵ
تامی هەتیویمی پێ چێشت
ئەو یەکجاری منی جێ هێشت











کە بە ناخی ڕۆحما ڕۆ چوو

دوا وتەی بۆم یەک بزە بوو

دایکی بمێنێ پیر نابێ

پیار لە هەر تەمەنێکدا بێ

چاوی بێ دایکیم کردی گل

تەمەنم گەییە هەشت و چل

لەم ژینە پڕ ئەوینەمدا

بەڵام لەم ماوەی ژینەمدا

کەوتووم بەڵام لە سەرڕاوە

زۆر ئەوینی دیم گۆڕاوە

قەسەم بەو گڵکۆ تازەی تۆ

دایە گیان گوێ گرە بۆ ئاسۆ

چاوەڕێی لایلایە و شیر نیم

ئیدی من تازە سەغیر نیم

دایە وەک تۆ خۆشم دەوێ

هەرکەس دایکی شەهیدێ بێ

ئاوریان وەک شیری تۆ پاکە

تەواوی کانی ئەم خاکە

وەک تۆ ئەملاوێنن تارێک

سەرگۆی مەمکی هەر کانیاوێک











دایـــه وەک تـــۆ خۆشـــم دەوێ
هـــەر کـــەس بـــە زمـــانی تـــۆ بـــدوێ
تێدەگـــەن دایکـــی مـــن درانـــن
لـــە ئاســـۆی فیکـــرم بـــڕوانن

ساروقامیش، خەرمانانی ١٣٨٣











# ئارەزوو

سەردەمێکە ئارەزووی چاوێکی وەک دەریا دەکەم
ئارەزووی بەر تینی تاوی بەندی دەست سەرما دەکەم

لێی گەڕێ با هەر لە فێڵێ بن گەلی خۆخۆرەکان
من بە یادی چاوی تۆم، تۆ چی بڵێی هەر وا دەکەم

سێبەری عیشقم لە سەر بێ تاجی شاهیم بۆچیە
تیشکی چاوێکم هەبێ گاڵتە بە شێخ و شا دەکەم

تا ترووسکەی بەرقی جوانیی دەرکەوێ پەروانەییم
بۆ ویسالی نوور هەمیشە کاری بێ‌پەروا دەکەم

گەر هەواڵی تۆ بە شەودا بای شەماڵ بێنێ لە بۆم
ڕیزەملوێنکێ وشەی جوان پێشکەشی شەوبا دەکەم

کوانێ ئەو بەرگ و لیباسەم بچمە کۆشکی حاکمان
یا ئەگەر بشلێن وەرە! هەر خۆم لە قودرەت جیا دەکەم

من دڵم کانگەی ئەوین و دار و بێری و کانییە
نا! پەشیمان نیم لە ڕێگەم، دڵنیا بە چا دەکەم!

نایەڵن تاوێ لە ئاوێنەی خەیاڵما دەرکەوی
بۆیە وەک مەجنوونی بێکەس دایمە یالەیلا دەکەم

تۆ هیلالی دوو برۆت دەرخە لە «ئاسۆ»ی جەژنەوە
جا دەزانی چۆن لە وەسفت مەحشەرێ بەرپا دەکام

بۆکان ١٣٨٥/١١/٢٥





## بەردو هەورامان

کـاکی هـەورامی وەکـوو کـەو نیشـتووە بـەو بـەردەوە
پێچەکـەی خـوار و خلـێچ نـاوە بـە سـەر گشـت دەردەوە
خاسەکەرئاسـا دەخـوێنێ لـەو سـەرە بـەو زەردەوە
خۆی لە خەم ڕەخساندووە و دەیڵێ بە جووت و فەردەوە
کیـژی هـەورامیش سـپیوسـۆڵ بـەو کراسـی زەردەوە
شاخی هەورامان دەڵەی لەو عەرزی خۆی بێزار بووە
هەر سەراسەر شاخ و بەردە و ڕوو بە عاسمان هەڵچووە
چۆمی سـیروان شـینەمـاری پـڕپڕ و فـێ گرتـووە
شاخ و بەردی دەور و پشتی وەک پەنیر قاش کردووە
گـەرچی بـێنـازە بـە دەسـتی خـاوەنی نامـەردەوە
ئـاو ئەگـەر مایـەی ژیـانی گیـا و مـرۆڤ و ئاژەڵـە
لێـرە وەک خـاکی ولاتـی دەشـتەکی بـێهاوەڵـە
خـاک و ئـاو وێکـڕا دەنەخشـێنن ژیـانی کۆمەڵـە
گەنم و جۆ لێرە غەریبن جا مەگەر یەک دوو پەڵە
دیارە وەک خاڵێ بە سەر کوڵمێکی زۆر بێگەردەوە
ماندوویی هیچ نایەڵێ بن سێبەری دارگوێز و توو
گوڵهەنار وەک سوورەتارای بووکی تازەی خەندەڕوو
بولبول و قومری لە سەریان گوڕڕەیانە دوو بە دوو
شەرحی شادی و ڕەنجی کوردان دادەڕێژن موو بە موو
مەست و سەرخۆشن بە دەوری دایەرەی مێژووەردەوە





کیژی هەورامی بە جلکی زەرد و سوور و شینەوە
جاربەجار چاو لێدەکا ئەمما بە بێ هیچ تینەوە
هێندە ڕازی و خۆشدڵە بەم خاک و ئاو و ژینەوە
چاو لە کەس ناکەن ئەمەش مەجبوور دەبین لێی بینەوە
هەر بناڵێنن لە حەسرەت عاشقی بێ پەردەوە
دەنگی هاڕەی ئاوی بێ ژەنگی خەفەت دەسڕێتەوە
هەر بڵەی کۆسەی هەجیج! ئیدی بەسە و دەبڕێتەوە
هەر گوناحێکت هەبێ بەم فاتیحا دەسڕێتەوە
تا بەرەو پاوەی دەڕۆی بەو دار و بەردەی ڕێتەوە
دڵ دەلەرزێ هەر وەکوو منداڵ بە ئاوێ سەردەوە
شاخی هەورامان بەڕاستی عاشقی ئەستێرەیە
هێندە ڕژد و بەرزە پێم وا بانی عەرزی ئێرەیە
ژێری دەستی شێری عاسمان شاخی ئەم شمشێرەیە
بەفری شاهۆ باعیسی ئەم چۆم و ئاوهەڵدێرەیە
پاوە هەر ماوە بە پاوە بەم گ ڕەنج و دەردەوە
لادەبا وەک ئاوی زەمزەم سەدهەزار دەرد و بەلا
تاقە یەک شەربەی لە ئاوی غارەکەی قۆری قەلا
سەیری جوانی ئەم وڵاتە جا لەگەڵ چەند هاوەڵا
دەفعی دەرد و چاوەزارە چەشنی نووشتەی مام مەلا
با بڵێم یارانی ئاسۆ کێن بە جووت و فەردەوە؛
کۆلکەزێڕینە ئەگەر جارجارە بێتاقەت دەبوو














گەر «سەعید» نەبوایە بێشک تاقەتی گشتمان دەچوو
خۆ لە بەر تیری عەزیزیش هیچ کەسێ بێبەش نەبوو
گەرچی تاریف ناکرێ پیاوچاکی ڕحمان و عەبوو
بانەیی شۆفیری چاکە بەو دڵەی بێگەردەوە

بۆ عەبەی سوڵتانی شوێنێ وا نەبوو نەرفێ دڵی
کاکە عوسمان ماڵی ئاوا و چادری چەشنی گوڵی
کامە شوێن سەرسەوزە خۆشە جا لە سەر بەرد یان گڵی
بۆی کەبابە و شۆخییە و ئیسکان و قلیانە و قوڵی
کێ بە وێنەی سەیدعەلی کێوپێوە بەو سەر هەردەوە

بۆ کەسێ زەوقی هەبێ شاری ڕەوانسەر جەننەتە
حەوز و ئاو و پارک و پردی گشت نموونەی شەوکەتە
لاوی ئازا و کوردیپۆش خەڵکی نموونەی هیممەتە
داخەکەم ئەم شوێنە هەندێ دەستەبەستەی سوننەتە
خۆ دەنا وەیسیشی دەبوو قەیسی لەیلای پەردەوە

حەیفە باسی ئاویەریش نەکرێ لە نێو شیعرێ بە کوڵ
هەر دەبێ باسی ئەوی بخرێتە نێو سەندووقی دڵ
پەرچەم و ڕێحانە تێکەڵ ڕاوگەیە بۆ ئاسکی سڵ
جا مەگەر پیری نەهێڵێ ڕاوی ئاسک و پۆڕێ شڵ
خۆت بخەیتە جەغزی جەنگی نێو گرێو و نەردەوە

مۆز بخۆیت و مۆز بکەی تاکوو موکوریان بێ وچان





داخەکەم بۆ هاوەڵێ بەرز بێ بە بەرزی ئاسمان

دڵ وەکوو بەحری خەزەر بێ و خۆی چکۆڵەی هاوەڵان

هەر مەبەستم شیعرە ئەینا هاوەڵانم گشت وەهان

چیتە «ئاسۆ» بەستە دەستی بێوەفایی بەردەوە



هەورامان گوڵانی ١٨ی نەورۆز









# هەور

دڵەی ئەم هەورە وەک من دڵپڕە و بارانی پێخۆشە
عەرز وەک هەستی من ویشکە و تەڕی جارانی پێخۆشە

کەژ و کێو شاڵی سەوزی کردە بەر کفنی دڕی یەکسەر
بەڵێ بەردیش لە ئەم وەرزە هەوای بارانی پێخۆشە

بەهارە و بولبول و قومری لە بادەی شەونمان مەستن
مەلیش هەر وەک بەشەر سەیرانی ئێوارانی پێخۆشە

کەسێ هەستی هەبێ لەم وەرزەدا شار کونجی زیندانە
بەحاڵ عەقڵی هەبێ جێژوانی گوڵزارانی پێخۆشە

گوڵان و خاکەلێوە وەک تەمەن زوو ڕادەبوورن ها!
کەسێ گوڵ شک بەرێ کوا پارکی نێو شارانی پێخۆشە

گوڵ و بولبول دەر و دەشت و ڕەفیقێک و قەراغاوێ
ئەگەر بۆت دەس بدا کێ سەیری بێکارانی پێخۆشە

وەرن چاو کەن تەنانەت مار و مێرووش شاد و سەرخۆشن
ئەشا مێروولە چەندە یارمەتی یارانی پێخۆشە

مەڵێن شاعیر خەیاڵی خاو دەکا ئەو چاوی دووربینە
خەڵک زاری دەوێ ئەو ماچی نێو زارانی پێخۆشە

ئەگەرچی تا هەیە «ئاسۆ» دژی جەنگ و هەرا و زوڵمە
ئەوەی ڕووی دا لە بەغدادا لەبۆ تارانی پێخۆشە!

بۆکان ۱۳۸۱/۱/۲۷









# هەڵوێست

چـــەن گونـــاحن واژەی ئـــەو شـــیعرانە زینـــدانی کـــران

چەنـــدە زینـــدوون ئـــەو وشـــانەی وا بـــە دەس زاڵـــم مـــران

بـــۆ شـیعر گـــەر هـــەڵوەرێنم ئەشـکی ڕوون بـــێ هـــۆ نییـــە

ســـاڵەهایە لـــەم وڵاتـــە شـــیعر و فرمێســـک بـــران

ئەو ئەگـەر تـا ئەسپە ڕێـی دووری منـیش تـا زولفـی تـۆن

فـەخرە بـۆ عاشـق بـە حـەڵقـەی زولفـەوە هەڵواسـران

کـوانێ گـوێی مێـژوو کـەڕە زێـڕی لـە گوێـدا هـەر هەیـە

بێجگـە لـەو ئـاوازە بـێوەزنانـە وا پشـتگـوێ خـران

شیعری چاک ئەوڕۆکە سووکە کێشەکەی کێشەی لە دوون

ڕاسـتە هـەر وا سـووکە زێـڕ و قیمەتیشـی هـەر گـران

گـەر بەهەشـتم پـاک دەنـێ دەسـتم لـە هەستم هـەڵگرم

هـەر دەڵـێم خۆزگـەم بەوانـەی وا لـە جەنگـەی ئـاوران

بـا بسـووتێ هەسـتی دڵـداریم بـە عیشـقی پاکـەوە

نـووری ئـەو سـووتمانەیە ئێسـتاکە بـۆ ڕێمـان چـران

ئێستە پۆستمۆدێرنە «ئاسۆ»! خشڵی بووکی شیعری کورد

کـوانێ ئـەو شـیعرانە وەک گوللـەی بـەرەو دژگـەل خـران

بۆکان هاوینی ١٣٨١



## دەواری عەشق

کەس نەبوو گەر خەنجەری عەشقی بە پیری گر نەبێ
کەس نەبوو پەنجەی گوشینی زەردەبەی لێ سر نەبێ
وردەوردە کۆن دەبێ چیرۆکی عەشقی ئەمن و تۆش
حەیفە ئەو تین و ئەوینە هەر بە سۆز و گڕ نەبێ
لەم هەوارە هەر دەواری عیشقە وا قەت ناپوێ
بێجگە لەو نەمدی دەوارێ گەر بە بای ژین شڕ نەبێ
نایەتە سەر لێوی کەس بادەی خەیاڵی مانەوە
تاوەکوو پیاڵەی دڵی بۆ خۆشەویستی پڕ نەبێ
کەی لە جۆگەی شادمانیت پووشی خەم دەخرێتە لا
گەر شەتاوی پڕخورۆشی جوانپەرەستیت پڕ نەبێ
تۆ ئەگەر غەمباری جەوری گورگی خوێنڕێژی منی
دوور بە لێی نەیدیوە کەس خێڵی گورگ زگدڕ نەبێ
هەر کەسێ لافی برایی و گەلپەرەستی لێدەدا
جوانی تێبڕوانە «ئاسۆ»! ئاگەدار بە زڕ نەبێ

مەهاباد، ١٣٧٦/٣/٢








## غەزەلی کەس‌نەکردوو

هەر دەڵێم و هەر دەڵێم و هەر دەڵێم
هەر شەوڕێم و هەر شەوڕێم و هەر شەوڕێم
هەر خراپە و هەر خراپە و هەر خراپ
دێتە ڕێم و دێتە ڕێم و دێتە ڕێم
هەر مەهێڵن هەر مەهێڵن هەر مەهێڵ
هەر لەوڕێم و هەر لەوڕێم و هەر لەوڕێم
هەر دەڕۆم و هەر دەڕۆم و هەر دەڕۆم
تاکوو دێم و تاکوو دێم و تاکوو دێم
با دەرم کەن با دەرم کەن با دەرم
نیشتەجێم و نیشتەجێم و نیشتەجێم
هەر لە ڕوو ناچم لە ڕوو ناچم لە ڕوو
بەردەپێم و بەردەپێم و بەردەپێم
بەرزە «ئاسۆ»م بەرزە ئاسۆم بەرزە هەر
ناچەمێم و ناچەمێم و ناچەمێم

بۆکان ١٣٨٤/١٠/٤









# شینی ڕێبەر

لەودەمەیڕا باسی دارا و شاهی ئەسکەندەر بووە
شینی مەرگ و کۆچی دوایی پیاوی ناماوەر بووە

جاری وایە ڕێبەری سەرشانی میللەت جێیەتی
وەک «موبارەک» زۆری پێ ناچێ لە شارا دەر بووە

سەیر نییە بەرد تا بەرەو عاسمان بچێ هەر عاقیبەت
هاتنە خوارێی حەتمیە، کێ تا ئەبەد جێی سەر بووە

مەرگی ئەو ئاڵابەدەستەی قەت لەبیر ناچێتەوە
بۆ نیزامی ئەژدەهاکی کاوەی ئاسنگەر بووە

هەر لە یادی گەل دەمێنێ تاوەکوو شۆڕش هەبێ
ئەو کەسەی وەک شێخی مە تا مەرگی هەر ڕێبەر بووە

خاکی خۆی بۆ مردنیش گیر ناکەوێ، چونکا لە ژین
دوژمنی چینی ستەمکاران و داگیرکەر بووە

چەندە سەختە ئەودەمەی یەک گەل خەمینن بۆ کەسێ
فەلسەفەی وەحدەت لە عەینی کەسرەتیدا هەر بووە

زامی کۆنی کۆچی دووری گۆڕغەریبان هاتە سۆ
دیوتە چۆن چوارپارچە کورد چاویان لەخوێناو وەربووە

قەت بووە سەربەست نەوێری تەسلیەت بێژی بە کەس
تا کەمێ فێنکی کەی ئەو جەرگەی گڕی تێبەربووە

دەک سیاسەت بێتە نێو ئەم دینە «ئاسۆ» تا ئەدی
قەت نەبینی حاکمی زاڵم مەلای مینبەر بووە

١٣٨٩/١١/٢٢





# ئەنیستیتۆی درۆ

بــە ســەر شــانی شــیعرما دێتــە خــوار لــەنگێزەبارانێ
ئــەوەی رەنــگزەردی پـاییزی نــەبێ قــەت قــەدری نـازانێ
بەهار هات و وڵات خـەملا وەکـوو کوێستانی گرشیلان
لە بەر خەیمەی گوڵاڵان بووک دەبێ تـارای سـەری دانـێ
بەهار یارەب بەخێر بێی خێروخۆشیت بۆ سورووشت هێنـا
ئــەدی ئـاخر بــەهاری نەشـئەیی ئـەم میللەتـە کـوانێ؟
دەیان وەرزی بەهار هـات و هـەزاران خۆزگـە بـەو زسـتان
کە رێبەندان بەهارمان بێ دڵم چۆن خۆش دەبێ جوانێ
ئــەوەی نــەخش و کـری دەسـتی خودامـان لـێ دەشارێتۆ
ژیــانی ژێردەســی دێنــێ بــە قیمــەت نیولــەتێ نــانێ
ئــەوەی جـوانی نـەبینێ کـوانێ هـاورێی شـاعیری رەنـدە
ئەنیســتیتۆی درۆ ئوســتادی نــاوی غــەیری شــەیتانێ
بەڵام هەر دێ زەمـانێ گـوڵۆشـەی شـیعرم بـە رێـز بگـرن
ئەوین سەرداری میللـەت بـێ و سـپای دەرد و درۆ رانـێ
ئەدی ئـەو کاتەیـە «ئاسـۆ» بـزەی سـەر لێـوی هەڵبەسـتی
دەبێتــە تیشــکی شــەوگاری کــچ و لاوانــی بۆکــانێ

بۆکان ١٣٨١/٣/٦





# بۆ کیژێکی هەورامی

کــەنگێ چــاوی تــۆ لــە چــاوم‌دا وەکــور بێگانەیــە
یــەک نەناســینمان لەســەر چاومــان بــە وێنــەی تانەیــە
لای ئــەمن ئــازادی ئــەووەڵ ئاشــنایی عیشــقییە
خۆشەویســـتی بـــێ شناســـی باشـــترینی وانەیـــە
ســەروەتی مــن ســەوتی تۆیــە دەنگــی داوودی چیــە؟
ســـەوتی داوودی لـــە حانـــدت کۆنەیـــە، ئەفســـانەیە
وەک ئەمن کەم کەس دەزانێ تۆ لە کام بورجی خودای
جێــی فرینــی تــۆ لــە کــوێی ئــەم خاکــە بێ‌ئاســمانەیە
عەتری گوفتارت بەلامدا دێ وەکــور مــەی مەســتمەکا
چێــژی دیــدارت دەوای زامــی دڵــی ســەد دێوانەیــە
سەیری چاوی خۆت بە چاوی شاعیرانەت قــەت مەکــە
هەر کەسێ عاشق بە خــۆی بــێ لای خــەڵک بێگانەیــە
مــن دڵــم ئاوێنەیــە بــۆ بــووکی هەســتی پــاکی تــۆ
پەنجەکانیشــم لــە بــۆ زولفــت بــە وێنــەی شــانەیە
ئەی فیدای ئەو خاکە بــم وا تــۆ لــەوێ پــەروەردە بووی
شــیرنیت هــی ئــاردەتووی ئــەم خــاکی هەورامانەیــە
نامەوێ مــن بــاغی ڕوخســارت بــە زەردی ســەیر بکــەم
ســەیری باغــت خــۆی لــە ڕێــزەی مەرتەبــەی شــاهانەیە
پێــرێ پــەیمانی ئــەوینت یــەک نیگــا نووســـیمەوە
بــۆچی ئێســتا ئــەو نیگــات وەک کــۆتری بێ‌هێلانەیــە







را وەرە نێزیک بە لێم وەک جامی بادەی هەستی تۆم

بـا دڵـی مـن پیاڵـە بێ هـی خـەڵکی داو و دانەیـە

ڕێی نییە «ئاسۆ» لە باغت تاقـە یـەک گـوڵ بـۆن بکـا

بەختی ئـەو هـەر وایـە، شـاعیر مـافی ئـەم شـیعرانەیە



هەولێر، ١٣٨٤/٩/٢١

٢٠٠٥/١٢/١٢







# شریتی ناوەڕوو

دار و بەرد و کێو و نار جێ‌پێی چەلانی لاوییە
دەنگی پێی ئەسپی تەمەن دێ لەم کەژە بەرداویە
ئەم کەژانە نالْ و زەردن هێندەیان دی چاوکەژالْ
سوورەتێکی کردگارین کانیەکانیان چاویە
وا شریتی عومری لاوی ناوەڕوو دەخولێتەوە
سەد هەزار سەوزەی تیا بێژراوە هێشتا ماویە
تالێ مووی پەلکەی گوڵێکم لێ بووە پەلکێ شێعر
خاڵی ئەو خۆراکی شێعرە و زولفی تەپکە و داوییە
بۆیە تا ئێستەش مەلی ڕۆحی خەیالْم عاشقە
تاکوو مردن هەر بە یادی ئارەزووی فەوتاویە
عیشقی لاوی هەر وەکوو لاولاو لە دڵ هالاوە هەر
بۆیە پیریش بم هەمیشە عیشقی من لاولاویە
شیعری «ئاسۆ» پاکی دەردی خۆی و گەلیە چاوەکەم
تاکوو دەستی ڕوو نەبێ هەر بۆیە «نەورۆز» ناویە

ساروقامیش ١٣٨٤/٩/١٦








## دوو بەیتی

چــەکچ‌ومــــاڵۆکی پــــەنای میرقــــازی
پــاکی گـــوێی دابـــووە ســـەلاح و ســـازی
هـەمور ئـەم شـوێنـە لـە «ئاسـۆ» تـاڵ بـوون
بـــێ پــــەزیرایی کــــەماڵی قــــازی



نەورۆز

قزڵجە، ۸۴/۳/۱۵ـ۹۳







# ئەوینی نهێنی

شیعری مـن چـاوی سـەرم بـۆ گوڵـەکانم دەدوێ
چاوی تـۆش بـۆ منـی «شـەیدا» لـە خـەزانم دەدوێ
یارەکـەم پـاییزی مـن زۆر لـە بـەهار خۆشترە چـون
مامەکـەم ئێستا لـە «یورـ ئێن» بـە زمـانم دەدوێ
دیارە من ڕەنج و غـەمم کردمـی مانـدوو لـە ژیـان
چاوەکـــەم چاوەکـــەت ئـــەمڕۆ لـــە وچـــانم دەدوێ
ئەو هەموو ناز و عیتابەت بەسە بـۆ ئـەمنی هـەژار
بەسـیە «قوربـانی» جیهـان وا لـە ژیـانم دەدوێ
قەومی کورد ئێستە لە دونیا شـەڕەفی بـەرزە کەسـم
دەنگـی ئـەم بـێ‌کەسـە ئـەمڕۆ لـە جیهـانم دەدوێ
ڕەببـی ئـاوا بـێ ولاتـم کـە ئـەتۆی کـردە گـوڵم
دڵ بـە کـۆی عەشـق و سیاسـەت لـە شـەوانم دەدوێ
بـەم هـەموو ئاهـەوە قـازانجی منـە قـەڕنی ئـەتۆم
دوژمنـــە کۆنەکەیـــە هـــەر لـــە زیـــانم دەدوێ
ئەی خودا شـوکری ئـەتۆ چونکـە منـی دوورە بـەهار
وا چریکـــەی کـــەوی‌خاســـە لـــە کـــەژانم دەدوێ
نامەوێ دەنگی قـەل و داڵـی لەسـەر لاشـە کـە مـن
وا ورینگـــەی مـــەلی شـــەیدا لـــە گـــولانم دەدوێ
یەک بە یەک بەیتی ئەوینی منی «ئاسۆ» بکـە شـی
تێدەگەی چۆن کە لە سـەر عیشـقی نیهـانیم دەدوێ!

بۆکان ١٣٨٤/٦/٢٥





# دەگوزەرێ

ئەم عومرە کە وا پڕ گڕ و بۆسۆیە دەگوزەرێ
پڕ شادییە یا پڕ غەم و ڕۆڕۆیە دەگوزەرێ

لەم وەرزە کە هەر دارە گەڵای زەرد دەبێ گوڵم
سووری گوڵی ڕوخساری من و تۆیە دەگوزەرێ

دانیشە لە سەر کانییەک و هاوەڵێکی چاک
پەیدا کە تەمەن ئاوە لە ئەم جۆیە دەگوزەرێ

ئەسرین مەڕێژە کاکە لە بۆ نامورادی خۆت
ئەمڕۆش کە لە دەورت دڕوو کۆکۆیە دەگوزەرێ

ئەو ڕۆژە کە پێت وایە ژیان خۆشە لا دەچێ
ئەو ڕۆژە دەڵێی ژینە کە بێ‌هۆیە دەگوزەرێ

باڵێ کە خودا داویەتی بۆ هەڵفڕینی مەل
دەشکێ و لەبەر هەوەسی دەنکە جۆیێ دەگوزەرێ

ئەم ژینە کە وا پڕپڕی جوانی و سەفا و شتە
لات وایە کە نەتدیوە چ نامۆیە دەگوزەرێ

هەر عیشقە کە وا سابتە، قەت کۆنە ناکرێ
خاڵۆت تەبەقەی هەشتە وە یا نۆیە دەگوزەرێ

ئەم پاس و وەڕینەی سەگەهارانەش عاقیبەت
وەک دژبەرەکەی لاوەتی «ئاسۆ»یە دەگوزەرێ



نەورۆز





بۆکان پردی کۆسە ١٣٨٤/٧/١٩





# غەزەلی هیچ

چیــە ئــەم ســەوزی و زەردی و لــە پــڕا بوونــەوە هــیچ

ئەگە بێ فەلسـەفە بێ هـەر، بـەڵێ ئیـدی ئـەوە هـیچ

خـۆ ئەگــەر زینــدەگی مانــای هــەبێ لــەم دایــرەدا

بە خەمی عیشقەوە هەر شەو نەخەوی، ئـەو شـەوە هـیچ

تۆ بـەبێ هـیچ لـە هـەوەڵ هاتیـە سـەر ئـەم تۆپـە گڵـە

سـەدهەزار هێنـدە وەخـرێ کـەی لـە پـڕا دەبیـەوە هـیچ

هـەر وەکـوو خەونـە ژیـانی لـەوە پێشـت چ دەکـەی؟

گەر کەمێ لەززەتی بۆ ئێسـتە نـەبێ، ئـەو خـەوە هـیچ

بـاب و بـاپیرە لـە بـەر چـاو دەکـەوێ بـۆ هەوەسـێ

بۆ تەمـەع بابـە کـە هـیچ و کـوڕە هـیچ و نـەوە هـیچ

لـــە مناڵیمـــــەوە زانیومـــــە ژیـــــان هـــــەر ڕاوە

ئـەو هــەمــوو ڕاوەئــەوین و هــەمـوو داونانــەوە هــیچ

عاقیبـەت لاقـی تەمـەن بـوو لـە چڵـێ داوی کـەوت

ئەو هەموو لاف و گەفین و هـەموو خۆبەستنەوە هـیچ

ژیـن هـەموو هیچـە مـەڵێن «ئاسـۆ» نەهیلسـتە کەسـم

ڕەوڕەوەت پووڵـە ئەگـەر پێـت نـەبێ ئـەو ڕەوڕەوە هـیچ

بۆکان هاوینی ١٣٨٤





# پرسیار

گەر گەڵایەک وشک ئەبینم

قاقا پێدەکەنێ پێم و باسی چرۆیی و بەهار و باران و سەوزیم بۆ دەکا

دەچمە سەر چۆم

بە پەلەیە بگاتە دەریا و قسە لەگەڵ هیچکەس ناکا

لە ترۆپکی چیاش بەفر هەر وا دەگری و

باسی توانەوەم بۆ دەکا

کۆتر دەگەڕێ بۆ جووتێ

دار هەر باسی سێبەر دەکا

کانی هەر وا

هەر خەریکی هەڵقوڵینە و هاواریەتی

ڕێبوار خەمی پرسیاریەتی.

دەچمەوە کن باوکم، بەڵام

خاڵۆ قوربان، سمایلاغا، عورووسی زوو و باسی خەونەکەی دایکمە

قورعانێکیان لە بۆ بردن

لە پاشان من هاتمە دنیا

هەموو شتێ لە ڕابردووی خۆیان دەدوێن

کەس باسی داهاتوو ناکات

ڕێبوار دیسان پرسیار دەکا

بڵێی لە داهاتووی نزیک

بەبێ ترس و خورپە و گومان ڕووبەڕووی گەل لە پیر و جوان

لە ژێر ئاڵای کوردستاندا

بخوێنمەوە شیعری ئازادی کوردستان؟!

بژکان ١٣٨٤/٥/١٦








## باوەفایێ بۆ نییە؟

لەم وڵاتە باسەفادا باوەفایێ بۆ نییە؟
ئاشنا زۆرن بەڵام دەردئاشنایێ بۆ نییە

هەر کەنار و دەشت و کێوی پاکی کونسێرتی مەلە
ئەو مەلەی فەرقی نەبێ لای شا و گەدایێ بۆ نییە

لەم شەوەی ئەنگوستەچاوە ڕوو لە کوێ کا شیعری من
ڕەنگی غاڵب هەر ڕەشە ئەی شەوچرایێ بۆ نییە

تۆ شەمی شەوگاری من بووی چۆنە شەوقت لێ بڕا
نامەیێکت ئێستەکە بۆ بێنەوایێ بۆ نییە

کۆن بووە چیرۆکی عەشق و خۆشەویستی چاوەکەم
چی لە دونیا زۆرە دوژمن ئەی برایێ بۆ نییە

هێندە لەو پەنجێرەوە ڕوانیمە دونیای دەورەدەست
ڕێگەشم لێ ون بووە ئەی ڕەهنومایێ بۆ نییە

کێ دەڵێ هەرکەس لە بەر چاوان نەما ڕەنگی نەما
دڵ حەسابە دایە گیان ئەی لایەلایێ بۆ نییە

دڵ نەبا «ئاسۆ» بە چی دەسچینی چاوی کۆ دەکرد
کۆ لە سەر خەرمانە ئێستا فێنکەبایی بۆ نییە

ساروقامیش، سەر گڵکۆی دایە
١٣٨٤/٣/٢١





## بۆ شایەری چاوەکانت

چاوەکانی خۆت نەدیوە گشت گەلی کوردیان هەژاند

چاوەکانت دوو هەڵۆن ئەمما دڵی منیان ڕفاند

خۆزگە بەو چاوەی ئەمن جارێ نیگای خۆتت دەکرد

تا بزانی چاوی تۆ چۆن ڕەونەقی تیشکی شکاند

کیژی دونیا کۆوەبوون ئەمجار دەڵێن کیژان پیان

تۆ بە تەنیا چاوەکەم ناوت لە سەر پاکیان فڕاند

دەنگی تۆ مەوجی هەوا هێنای و دەنگت کارەبا

هەرچی جوانی بوو لە حاندت پاکی ناحەزیان نواند

خۆزگە جارێ دیش لە ئاوێنەی کەناڵی کوردەوە

ڕووت وەدەرخەی تا وەڵابەی دووبەری و هەم تیپ و باند

شەپلە ماڵی شێوێ یاڕەب چونکە ئەمشەو شکڵی تۆی

کردە شەتڵی شیعر و هێنای و لە نێو دڵمی چەقاند

کاتێ فرمێسکت لە چاو دەرکەوت و دیم لەو جامەوە

دەسبەجێ پیاڵەی خەیاڵی تاڵی هیوای خۆمم ڕژاند

تۆ لە ئاوێنەی غەزەلدا جوانتری پیر نابی قەت

کەم وەکوو تۆو ئەو بزانەت جەرگی شاعیریان تەزاند

کێ وەکوو «ئاسۆ» بە داوی یەک بزەت خۆی پێوە کرد

هەر خەتێ بوو غەیری خەتتی لێوی تۆ پاکی کڕاند

بۆکان ١٣٨٤/١/٢٤





# خێڵی بقه

تۆ بڵەی چی بێ کەوا بولبول هەمووی شەیدا بووە

بۆ پەپوولەی بێنەوا شێتی شەمی سارا بووە

یانی ڕویشتن گەلی قالاوی زستانی گەلۆ!

ئێستە وەرزی نەوبەهارە و بۆنی گوڵ پەیدا بووە

دەشتوکێو پاکی سەفاخانەن هەموو جێگەی سەفان

وا لە شاڵ و شین و شالورر شۆڕشێ بەرپا بووە

هەر ئەتۆی لەم نەوبەهارە بوویتە ژاڵەی پاییزی

هەر منم تاڵەم ڕەشە کوا کەنگێ ژاڵەی وا بووە

خۆ منیش کوردم ئەدی بۆچی لە مافم بێبەشم

چونکە ئێستا مامی کوردە و حاکمی بەغدا بووە

خوایە ئاوای کەی وڵاتم چش منیش هەر بێبەشم

خوا شوکور ئێستا لە نێومان دوو هەرێمی چا بووە

هەر کراس زەردی دەبینم ڕەنگی خۆمم دێتە بیر

چونکە هەر خێڵی بقە لەم خاکەدا کوێخا بووە

هۆ کراس زەردی تەلایی هەر کە چۆپیت گرتە دەس

باش بزانە زۆری وەک من شێتی ئەو بالا بووە

هەر بە تەنیا شیعری «ئاسۆ»یە نەگۆڕا قیبلەکەی

وەک خەیاتەی زولفی یارم ڕاست و یەکهەودا بووە

باغی میراوا، ١٣٨٤/١/٢٩







# گوڕوگاڵ

گـوڵێکم بـوو لـه کـاتی لاوەتیمـا وەک گـوڵی ژاڵـه
هـەتا لێـوی ئـەوم دی تێگەشـتم لێـوی گـوڵ ئاڵـه
نیگای چاوی ترووسکەی شادمانی و عیشق و شادی بـوو
بـزەی لێـوی بلاڵـووکی ئـەوم بـوو شـەربەتی ناڵـه
وریشەی پووڵەکـەی دەسـماڵی دەتکوت پەڕتـەوی عیشـقه
بریقـەی کـوڵمی هـەر دەتکوت تریفـەی بـەفری قەدپاڵـه
له بیرم دێ چەلێکی هاتـه مـاڵم - مـاڵی خۆشـی بـوو -
ئەوێستاش لام وەکوو کەعبـەی ئەوینـه شـکڵی ئـەو ماڵـه
بەڵام کوێر بم که ئێستا تووشمەبێ نامناسێ وەک جـاران
ئەویش به زمانی منـداڵی گـەرەک هـەر پـێم دەڵـێ خاڵـه
ئـەویش وەک خـۆی نـەماوە نازەکـەی جـارانی شـێواوە
خەزان گەستوویه ئەو باغه ئەگـەر دەتکوت بـەهێی کاڵـه
حەساری باوەشـی جـاران لـه بـۆ مـن پـارکی شـاری بـوو
بـەڵام ئێسـتاکه دەیبیـنم تـەلاری خـەونی منداڵـه
که دەمـدی کـاتی ئێـواران لـه ڕێـی کـانی وەکـوو تـاوس
بـه جیلـوەی ڕۆیینـی تێـز بـوو دڵـم لـەو پێخـه ئاواڵـه
درێـغ و داغـی سـەنگینم چـەلێک بـۆنم نـەکرد ڕۆیـی
دەڵەی دوێنێکه بوو ئـەمما بـەوەڵلا بیسـتوهەشـت سـاڵه
منیش ئێستا چلوهەشـتم سـەرم «ئاسـۆ»ی سپی عیشـقه
کـه ئـەورۆ هاتـه بـەر چـاوم دەڵـەی وەرزی گوڕوگاڵـه

بۆکان ١٣٨٣/٧/١٤









## گوڵی خەزانی

لەم خەزانەیدا گوڵێکی سوور لە من پەیدا بووە
ڕۆژی ڕوونم لێ هەڵاتووە و مانگی غەم ئاوا بووە
ماڵی چاوی ئاوەدان بێ کۆشکی ڕووخاوی دڵی
ئاوەدان کردووم دەنا گوڵ کەنگێ دڵئاوا بووە
بەفری زستانی سەری پڕعەشقی تاواندوومەوە
دەردی بێدەرمانی پیری زوورەسی پێ چا بووە
ئەو دەپرسێ چۆنە حاڵی عاشقانەی من لە بۆی؟
جوابی نامەی شاعیرانەی عاشقان کەی «نا» بووە
من دڵی خۆم داوەتێ ئەو دوو هەناری داوە پێم
کەس ئەوەندەی خێر نەکردوون لەودەمەی سەودا بووە
هەر من و ئەو نین لە ترسی چاوی بەد یەک ناکەوین
تا حەسوود هەبووە لە دونیا کاری عاشق وا بووە
من گەدای بەردەرکی باغی سینەکەت بم عەینی شام
سواڵکەری شاری ئەوین هەر عەینی ئیستغنا بووە
لادە چارشێوت گوڵم خۆ تۆ لە قورعان شارەزای
«لا» وەکوو شمشێرە دینیش چاوی هەر لەو«لا» بووە
ڕازی عیشقی تۆ لە کن هەر کەس دەڵێم ڕیسوا دەبێ
خەڵکی شاهید بن کە «ئاسۆ» بۆ گوڵێ ڕیسوا بووە

بۆکان ١٣٨٣/٦/٢٥





## هەتا عاشق نەبی

هەتا عاشق نەبی گیانە لە ڕێدا شارەزا نابی
وەکوو چینی بە بێ ئاگر بە قیمەت پڕبەها نابی

بە خوێنی دڵ ئەگەر ڕووسووری دەرکی موڵک و میللەت بی
لە بەر قاپی خوداش ڕۆژی قیامەت ڕووسیا نابی

پەنات بێ پەرچەمی کاڵی کەزی چاوکاڵی قژزەردێ
لە لەنگێزەی ژیان و بەفر و تەرزەی بێ پەنا نابی

هەزار خۆزگەم بە سواڵکەر بچتە هەر دەرکێکی قەی‌ناکا
گەدای بەردەرکی یار بی تا قیامەت پادشا نابی

ژیان زۆر بێ‌وەفایە خۆشی هەروا، هەر غەمە سابت
دەزانم تۆ ئەوەندە پاکی دەگەڵ من بێ‌وەفا نابی

نەکەی بشکێنی ئاوێنەی دڵی پڕرازی عەشقی خۆت
ئەتۆ ئاسکی خەتای ئەوچەل لە ژیندا بێ‌خەتا نابی

سنوور هەر چەندە سەخت و ڕێگرە خەتتێکە بێ‌مانا
ئەوین پاسپۆرتی ڕێگات بێ ئەدی بادی‌هەوا نابی

ئەتۆ بووکی خەیاڵی شیعری «ئاسۆ»ی زۆر لەسەرخۆ بە
لە نێو باغچەی شیعردا واش مەزانە بێ هەرا نابی

بۆکان ۱۳۸۳/۱۲/۲۹



# دەبیرستانە تاقانەکەی بۆکان

کوورش ناوی پاشایەک بوو

بەڵام چل ساڵ بەر لە ئێستا

مەدرەسە نا!

هەر عەینی دانیشگایەک بوو

کچ و کوڕ لە پەنای یەکتر

دەغەڵی و ناپاکی قات بوو

وەک ئامریکا!

- ئەمە قسەی ڕەییس فەرهەنگی ئەو کات بوو -

بەیانیان

- وەک شارە مێروولەی هاوین -

لە هەر کۆڵانی شارەوە

بەرەو ئەم ناوەندی عیلمە

کچ و کوڕ ڕێیان دەپێوا

لە بەر زەوق و شادی ئێمە

دەرد و غەم و حەسرەت ون بوون

دەردان سەریان ل دەشێوا

دڵی قوتابی هێند گەرم وەک مەنجەنیق

کەچی لەپڕدا ڕووخان

کە دەهات دەنگی «ئای تۆفیق»

کاتی ڕیز بوون موعاونان نەسحەت و بەند



جارەجارەش بەدوبێرا

نموونەی ڕەحم و شیددەت بوو

کاک ڕەحیمی ئازادیخا!

چاومان لە یەکتر نەدەکرد لە پشت پەنجێرە و دوودەری

کچان ڕوومەتیان سوورتر بوو بە بێ ماتیک

ون بوون ئاساری ڕووسەری.

موعەللیمی قورعان و دین مامۆستا «شەفیعی» بوو

ڕشتەی دەرسیش تاقە «ڕشتەی تەبیعی» بوو.

سێ کتێبی گەورە و قەتوور

پڕ لە مانا، پڕ بوو لە عیلم و پڕ لە نوور

نەدەترساین، نە لە زۆری و نە لە کەمی

کاتێ بە دەسخەت و شکڵی جوانی بۆی

شەرح ئەداین لە پای تەختە «ئای ئادەمی!»

یادیان بە خێر ئەوەی ڕۆیین

عومریان درێژ ئەوەی ماون

گەر پێت سەیرە و پێم دەڵەی ئاخر ئەی ئێوە چۆن ماون

چاکە موومان چۆن سپی بوون؟

چاوکە پشتمان چۆن چەماون؟

ئەی بۆ فیزیک؟ ئای قورەیشی تا کاک ئەمیر

ئەم لیسانس و لاو ئەویش پیر

هەردوو دڵپاک، هەردووکیان چاک











وێنەی سەبر و تەحەممولی «ئاغای بێ باک»!

تاریخی ئای ئەحمەدزادە، جوغرافیاکەی ئای خودادا

جەبر و ریازی ئەکبەرزادە، سمێڵی بابری پرئیفادە!

یادیان بە خێر ئەوەی رۆیین

عومریان درێژ ئەوەی ماون

ئەوانی «ئاسەف» و ئای «هەمزەیی» لە هەموان زۆرتر گۆڕاون!

هاوکلاسمان عیدددیەکیان هەر نەشماون

ئێستا شاریش بەم گەورەییە خۆشی جارانی نەماوە

ئەو کاتەوە حەوزەگەورە چارشێوی بە سەریا داوە

قەڵای سەرداریش رووخاوە.

خۆ من ناڵێم ئێستاکە پێش کەوتن نییە

بەڵام چ بکەم لە رۆژهەڵات هەتا بیری کۆن سالارە!

هەر ئەمساڵ خۆزگەم بە پارە!

زستانی ۱۳۸۳





## ساڵگەرد

خۆزگە دەتزانی کە چەن مەجزووبی ئەو چاوانەتم

چەندە تامەزرۆی دەمێ سەیرانی ئەو بێستانەتم

من هەڵۆی ئاسمانی ڕاوچی کۆتر و کەو بووم کەچی

ئێستە پابەسراوی ئەو شابسکە کاڵ و جوانەتم

چیت لە چاوانتا حەشار داوە کە من نایبینمەوە؟

گێژ و ماخولیای خەتی ئەو دەفتەر و دیوانەتم

خۆزگە بەو پاساریيانەی وا بە دەوری ماڵتەوەن

گەر قوبووڵی کەی منیش باڵندەی ئەو گوێسوانەتم

تۆ حەسوودی هاوەڵی خۆتی بەڵام نازانی من

چەند حەسوودی ڕووسەری و ئەو دوگمە درگاوانەتم

گوارەکەش نامەحرەمە هەر سەیری کوڵمانت دەکا

بۆ مەگەر مردووم ئەمن؟ تاکوو ئەبەد لەرزانەتم

هەر شەمت هەڵکرد لەسەر کەیکی تەمەن زوو پێم بڵێ

تێدەگەی جا ئەودەمەی من باشترین پەروانەتم

نێوی «ئاسۆ»ش سووک لە لیستی عاشقانتا جێ کەوە

تا بمێنم هەر لە سەر ئەو عەهد و ئەو پەیمانەتم

سەدی بۆکان ۱۳۸۳/۱۲/۲۸





# بۆکان

لێم گەڕێ با بیدوێنم هێندێ شارە جوانەکەم
زێدی کوردی خۆشەویست و بووکی کوردستانەکەم
خەڵکی بۆ قوربانی جێژن کۆچ بە قوربانی دەکەن
من لەبۆ سەربەرزی بۆکان ڕۆح و سەر قوربان ئەکەم
باغی میراوای بەهەشتی عاشقانی دڵپڕە
باسی دڵپاکی و بەهەستی لاوەکانی با نەکەم
چون وردی لاوانی ئازای هێند بەشان و شەوکەتە
نزمە بۆ بەرزی ئەوان هێڵ و خەتی دیوانەکەم
لێم گەڕێن با باسی دەردی دڵ نەکەم دڵ پڕ غەمە
نەک بشێوێ حاڵی تۆش وەک زولفی دەسگیرانەکەم
ئەو قەڵا بەرزەی هەزاران داوەتی ڕەنگاوی دی
دێ تەنینی دەنگی زیرەک بولبولە خۆشخوانەکەم
ڕەمزی ڕاوەستاوی خەڵکی کێوی ناڵەشکێنەیە
حەوزەگەورە شک بەرم کوا باسی کۆشکی خان ئەکەم
تاکوو چارشێویان بە سەر ئەو حەوزەدا داخەکەم
شێعر و هۆنراوەش دەڵێ وشکاوە سەرچاوانەکەم
کوا هەژار و کوا حەقیقی و کامیل و سوارەی جەوان
هێدی و نووریش کە ماون و با لەوانیان جیا نەکەم
گەرچی ئاسۆ خاک و خۆڵی هەرچی کوردییە
لێمگەڕێن با زولفی شیعری شاری بۆکان شانە کەم







# فڕۆکەخانەی میهرئاباد

چـاو هـەموو تـەڕ سـوور وەک یـاقووت
خواحـافیزی تـاق‌تـاق جـووت‌جـووت
دڵـۆپ‌دڵـۆپ فرمێسـکی شـین
ئەڕژێتـە سـەر عـەرزی غـەمگین
مـۆنج ئـەخوا سـەفی بەڕێکـەر
موسـافیر یـەک‌یـەک دەچنـە دەر
نیـوەشـەوە و گشـت بێـدارن
چـاوەڕوانی کـۆچی یـارن
هێنـدێکیش چـاوەڕێی هـاتن
نـەک وەک ئەمانـەی دی مـاتن
تـەیارە کـاتێ هەڵـدەفڕێ
مـەیلی بـاب و فەرزەنـد دەبـڕێ
فڕگـە جـێ دێڵـن بـە زیـزی
دەسـت و چـاو بـۆ خواحـافیزی
شـل‌شـل دەبـن هێـزی ئـەژنۆ
چـاو پـڕ خـوێن دەبـێ وەک «ئاسـۆ»







تاران ١٣٨٠



# اندیشه

مـن در اندیشـه‌ی آنـم کـه تـو در بـاز کنـی

تو برآنی کـه چـه سان بهـر دلـم نـاز کنـی

دل مـن از غـم هجـران تـو بگرفـت ولـی

تـو برآنـی کـه بـرایم کلکـی سـاز کنـی

اگر از جلـوه‌ی دیـدار تـو سـوزم چـه عجـب!

خـوب دانـم کـه بسـاط دگـری بـاز کنـی

کـاش مسـتانه تـو را صـبحدمی مـی‌دیـدم

بـو کـه ایـن میکـده‌ی سـینه ورانـداز کنـی

هرکـه در میکـده‌ی دل لبـی تـر کـرد شـبی

ناسـزا نیسـت کـه بـا وی بتـی آغـاز کنـی

بلبل از شوق گـل ایـن چهچهـه بـر لـب دارد

تـا نظـر بـر گـل پژمـرده‌ی ایـن راز کنـی

یک شبی غمکـده‌ی عشـق مـرا هـم دریـاب

تـو تـوانی غـزلِ دل پـر از ایجـاز کنـی

«افق» آن سان شده‌ای واله که خواهی به قلبی

صحبت از وسوسـه‌ی خواجـه‌ی شـیراز کنـی؟

بوکان، بهار ۱۳۸۳









# عیشقی سەرەڕێ

تـۆ نۆگـوڵی جوانیـت ئـەوە پشـکووتووە ئـازیز

مـن تـازە گـەڵام زەرد بـووە عـەینی گـوڵی پـاییز

کـوا لـەم سـەرەڕێ دەبیـە رفیقـی منـی بـێ‌کـەس

عیشـقی سـەرەڕێ رەنجـە لـە ئـەم واتـە نـەبی زیـز

ئـەمما بـە خـودا عیشـق و ئـەوین هێنـدە بـەرێزە

پێـی نـاوێ ئەبـەد شـەرم و حـەیا و خـۆگری و فیـز

گـەر کەوتـە سـەری هـەر کەسـێ ئـەم دەردی ئەوینـە

پیر بێت و جەوان بێ وەکوو یـەک دێنـە سـەف و ریـز

مـن والـه و سرگشـتەی آن دختـر کُـردم

بِربـوده سَـبَق از همـه ترکـانِ بـه تبریـز

تـو خـود گُلـی آن شـاخەی گـل را بِفکَـن دور

جـز عشـوه و طنّـازی بـه خـود نقشـی میـاویز

ایـن طُرفـه جوانـانِ نـه عاشـق چـه شـرورند

ز آنجای که بنشستەای چون شـعله بـه پـا خیـز

بـەم سـوبحە هـەوا فێنکـە گـرِ بـەردە لـە «ئاسـۆ»

بـا کـەم بـە وشـەی کـورد و عەجـەم واژە بکـا ریـز

سنە، ناوبەر

١٣٨٣/٣/١٤





## شبی با او

به مرحمت باد صبات می‌خوانم
دلت پر از تپش است می‌دانم
تا گودترین اعماق محبّت به درود
بر بلندای قلّه‌ی عشق می‌مانم
هر شب به یاد تو با ستاره هم‌اشکم
یاد تو ابر است و من چو بارانم
بی تو واژه‌ای بی‌معنی‌ام لیکن
با تو معنا و لفظ را مانم
تو چه آسایش از برای نیاز
بیا که آرام بگیرد این طوفانم
مرا به لطف شاعرانه‌ای دریاب
همین یک امشب است بر تو مهمانم
آه که دل از تو لبریز می‌گردد
وای در این معامله پشیمانم!
«افق» ز نور پر شد و من اکنون
غمگسار آن سیه‌پوش تهرانم

تهران، ۱۳۸۳/۲/۳۰





# گێژاو

لە بەرزیڕایە گەر دیارە وەکوو یەک بەرزی و چاڵی
بە داوی عیشقە ئاسانتر دەگیرێ وەحشی و ماڵی
ئەگەر پێت وایە ئەم دونیا لەبۆ تۆ سەبت ئەکا یەزدان
لە دەرس و دەوری مامۆستای بەهار و گوڵ نەبووی حاڵی
بەهار دێ و تاجەگوڵ دێنێ خەزان دێ و زێڕی ئەڕفێنێ
کە زستان مووی سپی کردی ئەدی کوا وەک چەلان کاڵی
بزانی گەر ئەوینداری دەوای هەر دەرد و ڕەنجێکە
ئەدی قەتقەت لە دەس ڕەنج و غەمی ئەم ژینە نانالی
هەتاکوو دیت لە مەزرادا گوڵێکی زەرد و سوور و شین
بزانە چاوڕەشێ بوو گەر وەری عومری بە منداڵی
بە داوی زولفی تەهمینە ئەبەسرێ باڵ و دەست و پێت
ئەگەر بەدوای ونی خۆتا بە وێنەی ڕۆستەمی زاڵی
هەتا هوشیار و زانا بی وەرە لەم ژینە گێژاوە
بە چۆرێ مەی سەرت گێژ کە ئەرێ بۆ هێندە سەرقاڵی
مەڵێ «ئاسۆ» خەیاڵی خاو دەکا، نا، کرژە لۆی هەستم
هەتا کێو چەشنی سەیزادە گرێ دا نێوقەد و شاڵی

سارۆقامیش، ۱۳۸۳/۲/۹





# کەسی ئاسۆ

گڕووی شیعرم کە لێدەگرێ خەیاڵی بێنەشە و هەستم

غەمی دێ وەک کەلەبچە توند دەبەستێ پەنجەکەی دەستم

دەڵێی بەندیم و بێکەس چاوەڕێی دەستێکی عاسمانیم

دەڵێی گوڵزاری تینووم چاوەڕێی بارانی هەڵبەستم

چ چاوەڕوانییەکم بێ لە ئەو پەنجێرە داخراوە

لەکاتێکدا بە غەیری خۆشەویستی هیچ نییە قەستم

وەرە با هەر ئەسیری دەست و پەنجەی ناسکی تۆ بم

ئەمن خۆ هەر ئەسیری حوکمی وشکی حاکمی پەستم

ئەوەندەم دیوە زەجر و دەردی بێدەرمانی ژێردەستی

لەگەڵ ئازادی بێگانەم مەگەر ئەو کاتە گەر مەستم

ئەتۆ لێم دامەخە درگای بەهەشتی باغی سینەی خۆت

لەمێژە وەک پەپوولە هەڵوەدای گوڵزاری نەورەستم

کە چاوم لێ دەکەی نایمێنێ غەم دەنکێکی بۆ دەرمان

برۆم لێ تێک مەنێ من شێتی ئەبرۆی قاشی پەیوەستم

هەزار هێندە دەس و پەنجەم لە بەر سەرما نەنووسێ هیچ

ئەمن پەیمان دەبەستم تا دەمی ڕزگاری ناوەستم

دەزانی شاعیرانی کورد هەژارن، قانع و بێکەس

دەبا ئاسۆی دڵم ڕوون بێ بفەرموو ئاسۆ من کەستم

بۆکان ۱۳۸۳/٤/۷







## بۆ دوو نەتەوە

هەرچی گیا و چیمەن وگوڵ بوو هەموو شین بوونەتەوە
بەفری سەر دوندی چیا شوێنی نەما و چوونەتەوە
داخەکەم بەفرێ لە سەر گردی سەری من بووە کۆ
هەرچی هەست و کوڵ و تین بوو بەوە نیشتوونەتەوە
ئەو مەلە کۆچەرییانەی کە لە گەرمێن دەژیان
ئەوە نەورۆز و بەهارە و هەموو هاتوونەتەوە
ئەی چ بوو؟ ئەو کەڵەکێویانە کە قوربانی کران
بۆ گەلی سپڵە کەچی پاکی لە بیر چوونەتەوە؟
کوا نەواری بەنەشەی تەپڵ و نەقارەی گەلی لاو
بۆچی جەریانی ستەم یەکیەکی شۆردوونەتەوە؟
هەر سەرێ تۆزێ هەڵێ و ئاوەزی سەرداری هەبێ
پەتی سەر دار و تەنافە و ملی بەستوونەتەوە
کوا ئەوەش ژینە خودا دەک ڕەبی بەزیادی نەکەی
هەرچی تاوانە هەموو بۆ ئەمە شۆڕ بوونەتەوە
تورکی چاوەست لەمە بەدبەختترە لێمان بووە شێر
خوایە «ئاسۆ»یەکی ڕوون دەرخە لە ئەم دوو نەتەوە!

بۆکان بەهاری ١٣٨٩







# زیندانی دووکەڵ

«بۆ هاوڕێی شاعیرم جەلال مەلەکشا»

کەم بکۆخە! کەم کوورِ بەوە!

دە جارێکیش قاقا بکێشە

لەم وڵاتە سووتاوەدا مەمێنەوە

زۆرزۆر کە لێرە ژێر پێت خۆڵەمێشە

١٠۶

کەم بکۆخە، بەس کوورِ بەوە

دە جارێکیش وێنەی لاویت گورج و گۆڵ بە

کوا ئەو شیعرە وەک گوڵانەت

لەگەڵ شمشاڵی تفەنگدا

بەرانبەر بوو و ڕقەی دەکرد

کوا ئەو وردەت

دوژمن لە ترسانی دەمرد.

لەم وڵاتە سووتاوەدا مەمێنەوە

برِۆ برِۆ!

بۆ ئەو شوێنەی گوڵە نەرگس چاو هەڵدێنێ

کچان وێنەی گوڵەباخن هەموو بەیانان دەپشکوێن

شەوان وێنەی گوڵی شەوبۆ

لە شادی و بۆنی خۆش دەدوێن.

ئەی بەندی ناو بەندیخانەی دووکەڵ و گڕ

ئەی قەڵەمت وێنەی مەشخەڵ



هەموو چیای کوردستانی دەکردە گڕ

بڕۆ بڕۆ بۆ ئەو باغەی بولبول ڕێزی لە سەر چاوە

گوڵەباخ و هێرۆ لەوێ گوڵیان داوە

لەوێ برین قاقا پێدەکەنی بە ئێش

لەوێ دەریا پێدەکەنێ بە گۆلکە و زەل

لەوێنە زام گاڵتە دەکا بە گوللە و خەنجەر و خەردەل

چۆمی سیروان هاژەی ئازادیت بۆ دەچڕێ

لەوێ دەنگی گەلۆ و حەیران ئیشتیای دووکەڵت لێ دەبڕێ

دەستی نەرمی حەریری ڕۆژنامەی میللەت

فرمێسکی غەریبیت ئەسڕێ

لێرە بڕۆ

تۆ پەپوولەی ناو باغێکی سەملێدراوی

تۆ بولبولی دارستانێکی سووتاوی

تۆ شاعیری میللەتێکی بەش‌خوراوی

ئێرە جێگای هەستی ناسکی تۆ نییە

ئەتۆ وردت بەرزە بەلاّم لە سەر دووکەڵ وەک فەقیری ئاسۆ نییە

بڕۆ بڕۆ ئاواتەکەت هاتووەتە دی زۆر بە جوانی

دەلاّلانی بەر گاراجی شاری سنە هاوار دەکەن: " سولەیمانی، سولەیمانی "

شوانەکانی کوردەواری لێوی قەڵشاویان سارێژە لە سەر بلوێر،

بە شمشاڵی گەرووی شووشیان هاوار دەکەن

" هەولێر! هەولێر "

سنە ١٣٨٣/٢/٢٧







# پاییز

خشەی پێی تێگەیشتن دێ لە ڕەمزی جوانی پاییزی

لە بەرپێتدا کە دەنگی دێ گەڵای دارانی پاییزی

کە یەک کەوتن مەلانی کۆچەری ئەم شارە جێ بێڵن

سەهۆڵاوی سەفەریانە تکەی گریانی پاییزی

بەهاری وەرزی لاوی یادی خێر بێ چەندە زوو ڕۆیی

کەچی ئێستاکە تەڕ نابین لە بەر بارانی پاییزی

ئەتۆ عەینی گوڵی مانگی گوڵان پشکۆتووی ئەمما

منم کەوتوومە بەر سەرمای دڕی زریانی پاییزی

ئەتۆ شوعلەی گڕت پێیە چ باکت سایەقە و سەرما

منم دەستم دەلەرزێنێ برووسکەی ژانی پاییزی

ئەگەر شیعرێ دەنووسم بۆت دەلەرزێ دەست و دڵ وێکڕا

لە بەر سێخواری بێ‌میهری و هەوای ئابانی پاییزی

دەزانم تۆ ئەوەندە جوانی قەت‌قەت عاشقی زێڕ نابی

کە باغی کردە زێڕ یەکسەر گەڵاڕێزانی پاییزی

من و تۆ عاشقی کوردین لە سەر ئەم عیشقە قاچاخین

دەبێ هەر چاوەڕێی یەک بین لە چوارڕێیانی پاییزی

ببینە حاڵی «ئاسۆ»کەت کە چەند شێواوی بێ‌تۆیە

هەمیشە ئارەزوومەندە لە بۆ یەک ژوانی پاییزی

بۆکان – سەقز – پاییزی ١٣٨٩





## سەفەرێکی بێ کۆتایی

بۆ یەکەم جار

لە بەر چنگی ئەم خەریتە پشیلەییە پێم نا دەرێ و

بەرەو قیبلەی ئاواتێکی چەن ساڵەی خۆم

نوێژی سەفەرێکم دابەست.

کێو هەر کێو بوو

ئاو هەر ئاو بوو

دار هەر دار بوو

ئەوەی لای من فەرقی هەبوو نیگای خەڵکی لادێ و شار بوو

ئێستا من وام لەوپەڕ سنوور

تازەم زانی سنوور خەتێ بێمانایە

ئێرەش وەکوو ئەوێ وایە

بەڵام لێرە خەڵکی زمانیان ئازادە

خەت و جل و بیر و بڕوا ناشارنەوە

بافتی شاریش دێهاتییە

مەتعەمەکان چێشت ناخۆشن، کەوچک و چنگاڵ قاتییە.

کەچی بە سەر ئەم حاڵەوەش

من ڕەگ ڕەگم هوشیار نییە

چونکا لێرە ئەوەی بۆنی بێگانە بێ هیچ دیار نییە

باسی چەکوش و بزمار نییە

شوێنێ لە شاری مار نییە











لێرە شەوان ئەستێرەکان نزیکترن

خەڵکی بە تاسەی مافەوە بەلای یەکدا ڕانابرن

کچان ڕوومەتیان سوورترە

ومە ترسی چاوەبڕکێ

هیچ کەس چاو لە یەکتر ناکەن لە پشت پەنجێرە و دوودەری

نەورۆز کچان کە چوونە دەر بێ ڕووسەری

۱۱۰ هیچ ناترسێن لە تووسەری

خاک هەر خاکە

ئاو هەر ئاوە

دووکان هەموو پڕن لەو شتانە کە وا لەودیو دەمدین

بەڵام لێرە، پەنجێرەی دووکانەکانیان بە زمان و خەتێ نووسراوە

ساڵەهایە من وەک دەروێش حووی بۆ دەکەم

وێنەی سەرباز شەوان تا ڕۆژ

بە خەیاڵ یەک دووی بۆ دەکەم

لێرە ترس غەوارەیە

لێرە ئەسکیناس پارەیە

لێرە ماشێن سەیارەیە

لێرە هەناسە هەڵکێشان زۆر سادەیە

شادی سوار و غەم پیادەیە

کەمێ بێ نەزمی گەر هەبێ هی ئەوەیە

ژینی سەربەستی بۆ ئێمە ڕەنگێکی کاڵ و سادەیە





ئێرە وڵاتێکی دیە

پێتەختەکەی دڵی منە

ئەگەر شەوگەلی تاریکە

ڕێگا ئەگەر سەخت و ئەستەم و باریکە

بەوەی خۆشە غەوارە و ئەجنەبی ونە

بەرانبەری پیاو و ژنە

لێرە ئەگەر دیوار نەوین

شاریان کپە

لە عەوەزدا زاریان پڕە لە دڵداری و ژوان و چپە

ئێرە وڵاتێکی دیە

ئەرتەشەکەی شیعری پەشێو و شێرکۆ و هەژار

پاڕلەمانی ئاواتی خەڵکی نەدارە

شەقامەکان ڕەگی شەهیدانی گەلە

کارەبایان ئەگەر نییە

دڵی شاعیرانیان لە نێو دیوانی شیعرەکانیاندا وەک بێتەلە

هەزار دوژمن لە نێو حەوزێکی شیعریان

یان دەخنکێن یان گشت دەکەونە پامەلە

ئێرە کۆماری کوردانە

شوێنی کوردە

پێتەختەکەی ئەراڕات و قەندیل و شاهۆ و هەڵگوردە.

قەڵادزێ ١١ی سپتامبری ٢٠٠١
٢٠ی خەرمانانی ١٣٨٠





# سێبەری شیعری ئەوین

لە سەر سپیایی کاغەز سێبەری شیعری ئەوین دیارە
ئەوەی هەستی نەکا یان ڕاونەزانە یان خەتی خوارە
ئەوەی خۆی بور بە بەرد و یاری وەک ئاو گەییە نێو دەریا
ئەگەر بشبێتە ڕووگە هەر لە ودمی گەورەیی یارە
ئەوین نەبوایە ژەهری دەردی دووری قاتڵی گەل بوو
ئەوی ڕۆحی ئەوینی تیا نەبێ پێش مەرگی مووردارە
لە دووری تۆیە پاکی ئاشناکان بوونە بێگانە
لە دووری تۆیە گوڵ لە حاندی دەردەکەم خارە
کە نەتبینم ئەوی گوڵزارە هەر وەک شۆڕەکات وشکن
کە دەتبینم هەموو دەشت و کەژ و کێو چەشنی گوڵزارە
ئەمن پێم وا پەپوولە ڕۆحی یارێکی تەمەن کورتە
ئەتۆ نایناسی ئامما جیسمی تۆ بۆ ڕۆحی ئەو یارە
هەتار خۆشی وەرەز بوو لەم هەموو ئێوارە ڕۆژئاوا
لە خۆشی ڕۆژهەلاتە هەر خەریکی مەشق و تیکرارە
بەیان کاتێ دەڕێژێ چاوی چۆم و دەشت و کێو و باغ
غەمی جێهێشتنی دوێنێی بە سەر ڕوخسارەوە بارە
کەسێ دووری نەچێژێ هەستی ناکا هۆی چیە «ئاسۆ»
دڵی پڕخوێنە لەم جێهێشتنە هەر سوبح و ئێوارە

بۆکان بەهاری ۱۳۸۰





## بی تو

خنده‌ها بر لبم بـی تـو ز اجبـاری اسـت
بـی تـو حتّـا بهـار تکـراری اسـت
در چهـارراه فصـول کردسـتان
جویبـاری از غصّـه‌هـا جـاری اسـت
ابرهـا هـم بـه مـا نمـی‌بارنـد
کـار اصـحاب هـم ز بیکـاری اسـت
درخت‌ها شکوفه‌شان چه بی‌رنگ است!
بلـبلان نوایشـان ز بیـداری اسـت
سـایه‌ی عمـر مـا دراز شـده اسـت
صـبح عقـل و غـروب دلـداری اسـت
تـو در آن‌سـوی آب‌هـای شـعور
مانـدنت در خفـا ز بیعـاری اسـت
پـای‌بنـد خـاک غریـب خـودم
مرزهـایم بـه زیـر پـا مـاری اسـت
مـن بـدان سـو نیـایمی برگـرد
رازق «ئاسـو» حضـرت بـاری اسـت
گـر بپرسـی هنـوز عاشـقمی؟
پـاسـخ رگ‌رگ دلـم آری اسـت






بوکان، ۱۳۸۷/۱/۲۶

روز ۱۳۷۲/۵/۱۹ با همسرم جهت علاج مرض به تهران آمدیم، به علّت فقر مالی در میدان آزادی روی کارتون اقامت کردیم. در هتل کارتن تا صبح نخوابیدیم و این غزل را سرودم:





(...)

بار الاهـا بـه درت نامـه سـياه آمـده‌ايـم
با دلی پاک ولـی بخـت سـياه آمـده‌ايـم
تو به يک نيم نگه ی طـرق کـرده بـه مـا
ليک چون بس نگرم وه! که چه راه آمده‌ايم
ما در اين شـهر بيـداد چـو تجّـار غمـيم
کـوه داريـم و بـرای پـر کـاه آمـده‌ايـم
مشتری کـرم و سـينه‌ی مـا کيسـه‌ی مـا
حُـرّه مملـو شـده از نالـه و آه آمـده‌ايـم
گر رضای تو به دريـوزه‌امـان مـی‌خوانـد؟
لک لبّيک به آزادی چـو شـاه آمـده‌ايـم
هرکس اينجا به طريـق هوسـی پويـد راه
ما بـه امّيـد شـفايت بـه پنـاه آمـده‌ايـم
ز مناجات «افق» می‌دهد هر لحظـه نگـاه
چون بدين در ز پی عفـو گنـاه آمـده‌ايـم

۱۳۷۲/۵/۱۹
ميدان شهياد







# نەورۆزی شەڕاوی

ئەگــەرچی نــەورۆزە و کــەژ و کێــو پــاکی ڕازاوە
شـەپۆلی ئـاگری شـەڕ دێ جیهـان پـڕ بـوو لـە ئـاواژە ئاژاوە
بەهارە وکچ، گوڵە و جوانی، هەوارە و غونچەیـە و بـاران
هەموو کۆرن کەچی دڵ هـەر لـە بـەر ئـەم حاڵـە گیـراوە
چلۆن خۆش بێ دڵم ئاخر تەمەن دەڕوا و غەم و شەڕ دێ
کەچی بەم حاڵە غـەمبارەش دڵـم هـەر گەرمـە تـا مـاوە
کە ڕادەخوشێ بە نێـو دڵـدا ترووسـکەی چـاوی ئەسـتێرە
لە سەحرای سینەکەی مـندا دەڵێـی مەحشـەر هەڵسـتاوە
لـە گرمـەی هـەوری بـارانڕێـژ زراوی کانیـەکان تـۆقی
کەچی لەودیوی خـاکی کـورد کرێـوەی شـەڕ پەڵـەی داوە
ئـەوا چەنـدین سـەری‌سـاڵە گـەلی مـن ئـاگری نـەورۆز
لـە مـاڵی وەر دەبـێ لـە جیـات گـڕی نەورۆزەکـەی کـاوە
بـەڵام مـن دڵنیـام ڕۆژێ بـەهاری ئێمـە هـەر دادێ
دەبیـنن داری سەربەسـتی گـەلی ئێمـەش گـوڵی داوە
لە «ئاسـۆ»سـەر وەدەردێنـێ هـەتاوی ڕوونـی ڕۆژی مـەش
شەوی ڕەش هەرچی تـوولی بـێ سـەرەنجامی بزەی تـاوە

بۆکان ١٣٨٢/١/٤



نەورۆز



# بۆ قەڵادزێ

شوێنی ژاری ماری هێشتا دیارە بەم ڕووی شارەوە
شیرنی هەر مارە هێشتا بەم هەموو ئازارەوە

تۆزی غوربەت قەت لە کورد نانیشێ لەم خاکەی بەڵام
تۆزێ فەقر و فاقەیە نیشتوون بە سەر هەر دارەوە

ئێرە کابەی تێکڕماوە کوا خەلیلێ ڕاپەڕێ
سازی کا چوارگۆشەیێ بەم جەرگە چوارپێنج پارەوە

هێند بە ترس و لەرزەوە هەستم دەنووسم دڵ دەڵێ
لێرە هەستی خۆت بڵێ ئازادیە مەیشارەوە

بازی خوشبەختی لە سەر شانی مە زۆر کەم نیشتووە
ئێستە دەیبینم لە بانی شاری پڕئاوارەوە

دەنگ و ڕەنگ و بەرگ و نووسینم ئەگەر ئامادە بێ
تازە شیعرم ناکەوێتە شوێن کڵاوی لارەوە

دەچمە هەر شوێنێ چریکەی دێ مەلی ئاشتی و سەفا
خوایە هەر بەرز بێ چریکەی ئەم مەلە بەم دارەوە

من بە دەنگی باڵی ئەو باڵندە هاتم وەک هەڵۆ
پێمە پەیغامێ لە شاری زیرەک و سەردارەوە

ڕوونە «ئاسۆ»ی ئەم وڵاتە هاوەڵان کوا مژدەیەک
دەم لە سەر لێوی ئەوینە و دەست بە سیمی تارەوە

قەڵادزێ ١٣٨٠/٦/١٦ – ١٠ی سپتامری ٢٠٠١





## گل‌پرست

نمـــی‌دانـــم ای گـــل چـــرا ایـــن‌چنینـــی
چو پروانـــه بـــر گـــل رســـی مـــی‌نشینی
چـــو بوســـیدی آن آســـتان مقـــدّس
مکـــانی ســـزاوار برمـــی‌گزینـــی
بســـوزی، بســـازی، بنـــالی و لـــیکن
بـــه‌جـــز شـــوق دیـــدار دیگـــر نبینـــی
نـــدانی کـــه خنجـــر برآهیختـــه خـــار
زنـــد بـــر دلـــت تـــا بخـــواهی بچینـــی
صـــداقت پـــرش نیســـت آبـــی چـــو بالـــت
چـــو پـــر مـــی‌گشـــایی نـــه اهـــل زمینـــی
نـــدانی کـــه دانـــم مـــرا خـــوار کـــردی
و دانـــی کـــه دانـــم نـــداری قرینـــی
دلـــی را ندیـــدم بـــدین گـــل‌پرســـتی
بلـــه ای دل غافـــل مـــن تـــو اینـــی!!
«افق» سرخ شد پر بزن گاهِ وَجـد اسـت
ولـــی تـــا گلـــی را نبـــویی نچینـــی!!

تبریز، بهار ۱۳۸۰











# شوعلەی ناز

زۆر لــەمێژە چــاوەڕێم دیســان ئەویــندار ببمــەوە
تاوەکوو مەستی هەبێ پێم حەیفە هوشیار ببمەوە
هــەر بــە پیری لازمــە پیــاو ڕووگــەیێ پــاکی هــەبێ
تــا نەیێتــە خودپەرەســتی گــوڵپەرەســتار ببمــەوە
ئێستە ناپرسن لە من یارانی جاران، مــووی سپیم
ڕووڕەشــی بێ هــەر بەشــی بــا خــاوەنی یــار ببمــەوە
تۆ وەرە گڕ بــەردە جەســتەی خەســتەکەم لــەم حاڵــەدا
با بە شوعلەی نازی تۆ وەک نــووری بێنــار ببمــەوە
چون بە ئاوی ئاشقی من مەستی شیعری تــەڕ دەبم
حەیف نیە لەم حاڵەدا یەک لــەحزە ئــەغیار ببمــەوە؟
دەنگــی چۆمــە و تینــی تــاوە و شــادمانی نەوبــەهار
با نەشــەی وان و شــنەی ڕەقســی گــەڵای دار ببمــەوە
هێنــدە بێــزارم لــە شــار و هاڕەهــاڕی ســەر شــەقام
وەک چــەلانی ژینــی لادێ بــێ خــەمی شــار ببمــەوە
لــەم بــەهارە بێ نەشــەیدا وا گــوڵیش شــەوقی نییــە
بــۆ گــەل و بــۆ نیشــتمانم زار بــە هــاوار ببمــەوە
لێی گەڕێ بــا هێنــدە قاچــاخی کەلیمەشــمان نــەبێ
من کە «ئاسۆ»ی دەردی کوردم خێوی گوفتار ببمەوە

بۆکان ۱۳۸۷/۲/۱۶

ئەم شیعرە پێشکەش بە «وەفا»ی کوڕم بە بۆنەی بیستەمین ساڵوەگەڕی هاتنە سەر دونیای.





# حەسرەتی رابردوو

هیندەمان حەسرەت بە دەورانی لەوەو پێش خواردووە
دڵ لەگەڵ خۆشی بە جارێ خەتتی خۆی هەڵبواردووە
سەرشوماری عاشقانی بێبەشی کرد شای ئەوین
دیم لە پێشدا نێوی منیان بەر لە گەل ئەژماردووە
شەو ڕەشی وا ڕشتە سەر نامەی هومێد و عاشقیم
سوورەگوڵ سەد قاقەزی بۆ ناهومێدیم ناردووە
تۆ ئیلاهەی خۆشەویستیت بۆ لە هەستم ڕەو دەکەی؟
حەزرەتی حەز خۆی دەزانێ خۆم بە وی ئەسپاردووە
خۆشەویستی دەرسی دانشگای دڵی بێچارەمە
دوژمنی و کینەش لەمێژە خۆی لە من داشاردووە
زۆر لەمێژە ڕەنگی سوور و شین فریوی دڵ ئەدەن
ئەو دڵەی من خوێنییە و قەت ڕەنگی خۆی نەبواردووە
پێتی دەبژێرم دەڵێن کەم کەی لە باغی من گوڵێ
گوڵچنی باغیم کەچی یەک دەنکی پێیم نەبژاردووە
تا قیافەی تۆ دەبینم لێیم دەشێوێ قافیەم
قافیە خۆی موشکلێ بوو دیارە هێ ئەمجار دووە
ڕۆشنی «ئاسۆ»یە وا ڕەش هەڵگەڕا وەک ڕەنگی خۆم
هیندەمان حەسرەت بە دەورانی لەوەو پێش خواردووە




مەهاباد، ١٣٩١/١٠/١٣





# هوای هجرت

امشـب دلـم گرفتـه و هجـرانم آرزوسـت

خشـکیده‌ی هجـران یـارم و بـارانم آرزوسـت

قلـبم گرفتـه در ایـن خـاک مهربـان خـویش

یـک‌دفعـه قصـد هجـرت تهـرانم آرزوسـت

از بـس غـم بـی‌نظمـی اوضـاع خـورده‌ام

آن جلـوه‌ی مـوزون جالـب مـیلانم آرزوسـت

دیری است شعری پر از شور دوگوشم نکـرده حـس

آن شـعر تـر و تـازه‌ی راژانـم آرزوسـت

از بـس ز چشـم فریبـای جهـان چشـم داشـتم

تـرک لذایـذ هـر دو جهـانم آرزوسـت

قنـد دلـم نـزد آب بـه قنـد و گـلاب و شـیر

یـک جـام تلـخ بوسـه‌ای از آن لبـانم آزوسـت

هرچنـد مـوی سـفیدم بـه سـکوتی بخوانـدم

امـا جـوان عشـقم و میـدانم آرزوسـت

همچـون گـدایی اسـت طلـب کـرده‌ام دراز

آن چیـز کنـی مـرحمتم آنـم آرزوسـت

امـا بـه یکـی شـرط بـه «ئاسـو» بگـویی تـو

مـن هـم غـزل شـاعر بوکـانم آرزوسـت

بوکان، ۱۳۹۱/۱۱/۲۲





# غروب دلداری

خنده‌ها بر لبم ز اجباری است
بی تو حتّا بهار تکراری است
ابرها هم سَتروَن گشته‌اند
کار اسحاب هم ز بیکاری است
رفته رنگ از رخ بوته‌ی گل‌ها
بلبلان نوایشان ز بیزاری است
سایه‌ی عمر ما دراز شده است
صبح عقل و غروب دلداری است
تو در آن سوی آب‌های شعری
ماندنت در خفا ز بی‌عاری است
پای‌بند خاک غریب خودم
مرزهایم به زیر پا ماری است
اگر از انحطاط می‌ترسی
بدان که دوره عصر بیداری است
من نیایم تو خواهی آر، برگرد
دوری از آب و خاک بیماری است
گر بپرسی هنوز عاشقمی؟
پاسخ رگ رگِ دلم آری است











# مژده

قاصدی داد به من مژده که او می‌آید
لب پر از خنده و با جام و سبو می‌آید

چه کسی باور این امر مُحالی می‌کرد
آبِ از جوی شده باز به جوی می‌آید

راز ما را نتوان کرد نهان ای رفقا
چونکه افشاگرِ اسرار مگو می‌آید

همچو سهراب ربوده است همه خواب و خورم
آن نسیم که از آن سبز پتو می‌آید

قلمم رقص‌کنان شعر تر و تازه دهد
گلِ تهرانیم آن غالیه‌مو می‌آید

تا کی اندر قفس هجر غم و غصّه خوری
دود شد ماه سِفند و سمنو می‌آید

صله‌ی شعر تو یک بوسه‌ی تَر زآن دهن است
که از آن زمزمه‌ی ضدّ عدو می‌آید

غم «ئاسو» نه غمی است که درمان نشود
شادمان است که آن عربده‌جو می‌آید

بوکان، ۱۳۹۱/۱۲/۸











# شیعری پتەو

خۆزگە بەو ڕۆژانە وا مابوون گەلی سوارەی بەدەو
شەپکە تا توندتر دەبوو شلتر دەبوو دەستەی جڵەو
خۆ چەلان چابور لە کوێستاندا بە ڕاوێ نەشئە بووین
ئێستە کوێستان چۆڵ و هۆڵە و تیا نەماون خاسەکەو
یادی ئەو یارانە ڕۆیین ئێستەمان لێ تێک دەدا
خۆ دەنا ژین بەردەوامە هەر وەکوو خۆی ڕۆژ و شەو
هەوری ڕەش هەوری بە سەر پەلکەی چنارا دا بە زۆر
دەست و لاقی ئەسپی ئاوەز هەر سەقەت ماوە و جەدەو
لێرە سوڵتانی ئەوین قۆڵبەست کراوە و بەندەیە
هەر وەکوو شامی دەفەرمێ موڵکی بێسوڵتان خەدەو
چۆن دڵم خۆش بێ بە فێڵ و فەرتەنەی قەومی درۆ
تیپی لاویش هێند خەواڵوون تازە هەڵناستن لە خەو
یا دەبێتە حەزرەتی زولڕیش و بنیادەمتەقێن
یان دەبێتە هەڵوەدای پاریس و بلفاست و ژنەو
گەر دەڵێی مەحوی لە نێو ڕۆحی غەزەلیا چی دەڵێ
ئەو دەڵێ بودلێر و یاکوپسن دەناسم من نە ئەو
وەی کە یارەب چەندە بێکەس ماوە دونیای شیعری کورد
بۆیە «ئاسۆ» ڕوو دەکاتە سەر زەوی شیعری پتەو








# کرمی خۆیی

خەو لە چاومدا گسک دریاوە ساقی با دەوە
ماری غەم ئاڵقەی لە سەر دڵ داوە بەم گشت یادەوە

دەورە با هی مەش نەبێ ئەم دەورە جامێ تێکەوە
تا سەمای سۆفی ببینن زار بە فووی ئەوڕادەوە

چەرخەکە هەر چەپ لە بۆ چینی هەژاران سووڕ ئەدا
چاوەڕێی چی تۆ لە نێو ئەم قاتی عەدڵ و دادەوە

کەی وەفای بۆ کێ بووە دەوران لە کەیخەسرەو گەڕێ
شیرینی عیشقە بە تاڵی ڕەنجەکەی فەرهادەوە

تاکوو یەکڕەنگ بێ ژیان تۆ هەر بە یەکڕەنگی بژی
لێی گەڕێ سەددەنگەکان با بچنە ئەوبەر جادەوە

کوا ئەوان دەستیان دەگا هاوڕێی دەمێکی ئێمە بن
دایمە سەرگەرمن بە دەستی دایەرە و ئەسنادەوە

ڕۆژ لەسەر بەرماڵی نوێژ دەستیان بەرەو ئاسمانە هەر
شەو لەگەڵ ساقی ئەسیر ماون بە جامی بادەوە

گەل لەنێو حەڵقەی هەڵە هەر گێژ دەخۆن و دێ و دەچن
سەر لە گەل زۆرتر دەشێوێ بەم هەموو ئیرشادەوە

کرمی داری هەر لە خۆیە ترسی بێگانەت
حاڵی «ئاسۆ»ش حاڵەتی ئەو ئاسکەیە هالاَ لە داو
کەس گرێی ناکاتەوە حەتتا لە کن سەییادەوە

سولەیمانی، هوتێل پەریژ
٢٠١٣/٣/١







## ساڵیادی موقبیل

شەپۆل کاتێ لەسەر چۆمی دەڵێ قامەت بە گوێی دارا
دەبێ سوجدەی بەری بۆ کێو لە زەردی خۆری ئێوارە
ئەوەی لەو کێوە سەربەرزانە ڕووی داوە هەتا ئێستا
قەڵەم بۆ شەرحەکەی کۆڵە دەبێ هەر بێ بە سەر زارا
دەبێ فەرهادی کوردی بی و لە کێوی بێستوونی غەم
بکێشی نەقشی شیرینت لە سەر سەفحەی دڵی خارا
دەزانی بۆچی کەژوان عاشقی ئەو شاخ و کێوانەن
هەزاری وەک سکەندەر لەشکەری بەو تاشەوە تارا
لە شاری ئاسن و سیمان و هارە کەڕ دەبێ گوێچکە
کەچی لەم کێوە قاسپەی دەچێ بە گڕی هەرای شارا
لە بن بەرد بەردی ئەم کێوانە هەڵدەقوڵێ زنەی یادێ
کە دەستیان دا بە یەک چۆمن بەوان تێراو دەبێ سارا
بە ئەو کەژوانە لاوەی سوێند کە لۆتسەی لا وەکوو گرد بوو
دەبێ مەشهوور بێ ئەم خاکەش وەکوو تاڤگەی نیاگارا
خەمی ئەو کۆچە ئاسانیش نییە چارەی بکا شیعرێ
وشەم سرکن بەڵام چ بکەم دەیانگۆڕم بە سەد بارا
هەتاکوو ببنە مووروو بیکەمە گەردانە شیعرێ سوور
بە دەستی خۆم هەڵیواسم بە بەر سای گەردنی یارا
کە «ئاسۆ»ی ئەم کەژ و کێوانە دەبنە قیبلە بۆ شیعرم
منیش بۆ لووتکە هەڵدەکشێم لە کێوی سەختی ئەشعارا

سارۆقامیش ۱۳۸۷/۸/۲۰



# عیشقی پیری

هەمیسان ماتم و پووروەی خەمیَ کۆن دەورەیان داوم
نە هێزی پێکەنینم هەن نە سۆمایی چەلان چاوم
وەتی من دێتە بیرم پاییزە وەرزی جودایی من
ئەریَ توخوا لە دەست ئەم گشتە جەورە چۆنە هەر ماوم
بە یادی چاوی یاریَ چاوەڕیَ بووم بۆ پشوو سالاَن
تەواوی کاتەکەم ئێستا پشوون ئاخ عومری فەوتاوم
دلَم چەشنی چەلان قەت جەزبی چاوی عاشقی نابیَ
ئەریَ توخوا بلَێی بۆ وام بە سەر هات؟ یانی پیراوم؟
قوماری ژینی دونیاییم بە دەرزی و دوگمە دەست پێکرد
یەخە و بەرۆکی لە من داخست و من نەمزانی دۆڕاوم
وەرە با من بە شوعلەی چاوی تۆ ڕۆشن بکەم ڕێگام
جەحەندەم پیری‌یە و ڕیسوایی خۆ من تازە بەدناوم
ئەگەر زوقمی دەمەو زستانی مەزرای مووی سەری گرتووم
بەچاوی تۆ قەسەم ئێستەش بە دلَ پێم وایە هەر لاوم
لە کاتێکدا تەمەن پاکی بەشی یەک عاشقی ناکات
لە نەفرەت چۆن نەکەم خالَی خەیالَی خاو و شێواوم
هەتا بەژنی ئەتۆ چەشنی چناریَ بێتە بەر چاوم
منیش بۆ تێوەهالاَنی بە عەینی عەینی لاولاوم
بەلاَم لەم عەسرەدا دەورەی قسەی بیَ‌وەزن و بیَ‌تامە
ئەمن چ بکەم قسەم قورسە و لە ئەو سووکانە جیَ ماوم
لە نێو بازاڕی کوێران ئاوێنەم داناوە بیفرۆشم
چ سەودایێکی بیَ‌سوودە؟ بە پیریش ئێستیَ هەر خاوم
ئەتۆ ڕووناکی ڕێگەی شیعری «ئاسۆ»ی خۆت بە سووک مەگرە
ئەمن مەزرایەکی ویشکم بە هەستی تۆیە پاراوم

سەقز، بەهاری ١٣٨٧







# زمانی گوڵ

لە مەزرای چاو و باخا چاو کە دیتی باخ و چاوە و دار
خورەی ئاوی شەتاوان دەبنە ئاهەنگ بۆ دڵەی خەمبار
ئەدی بۆ هیچکەسێ لەو باغ و ئاو و چیمەنەی نایێ
لە دار و باخ و ئاو و گوڵ بکا وەک ئابەڵەد پرسیار
بڵێ سونبوڵ! ئەرێ چەند وەرزە هەر ساڵ لێرەدا شینی
گوڵاڵە! تۆخودا چەند ساڵە دەبیە شەوچرای گوڵزار؟
ئەتۆش شیلان! چەنای چەن ساڵە ملوێنکی ملی باخی
ئەرێ گێوژ! چیە ڕەمزت لە پاییز دەبیە خاوەنبار؟
ئەرێ کانی! ئەتۆ فرمێسکی چاوی کامە مەجنوونی؟
لە ڕۆژێکدا کە لەیلایان بە شوو دا و تێکی نا کۆچبار
لە سووری ڕووی گوڵاڵە و سپیەتی کانیاوی ئەم خاکە
لەگەڵ سەوزی دەر و دەشتی دەرسکێ پەرچەمی دڵدار
هەتاوی ڕوونی دوارۆژیش لە عاقڵ چاو دەقرتێنێ
لەسەر ئەو ڕەنگە سێ براڵە لە سابلاغ چوونەتە سەردار
بە عیشقی نیشتمانم سوێند ئەوین گەر بوو بە دەسمایە
لە سەر تا پا زەڕەر بێنی بە چاوت دەبیە گەوهەربار
گوڵی جوانم بەهەشتی جاویدانی خاکی کوردانە
لەبەر جوانی سروشتی دەیکەنە دووقاش و سیان و چوار
منی «ئاسۆ»ی لە دەسما گەرچی بایە بوومەتە سولەیمان
زمانی گوڵ دەزانم نەک زمانی تەیر و موور و مار

ئارەنان ١٣٩٢/١/٢٣









## لۆتکەی غەزەل

ئەودەمــــەی دەروازەکـــانی گاڵـــە دەدرێـــن شـــاری دڵ
تێـــکدەشـێوێ و نایەتــە ســەر بــاری ڕاســتە کــاری دڵ
ڕێگــە هــەر دوورتــر دەبــێ و لارێ دەبێتــە ڕاســتە ڕێ
وا لــە کــۆک خــاریج دەبــێ ناکۆکــە دەنگــی تــاری دڵ
چەشنی بەرخی دوور لە دایک و ڕان لە شیوێکدا بە شەو
گــوێی فریشــتەش کــپ دەبــێ بــۆ بیســتنی هــاواری دڵ
ئەی خــدر! کــوا دەســتی نــەرمت بێتــە هاوڕێی پیلی مــە
تـــا نەبێتــە پــووچ و ئەفســانە لــە نێــو ئــەفکاری دڵ
مــن دەزانــم تــا نیگــای چــاوێکی یــاری جــوان نــەبێ
ڕۆشـــــنی قــــەت ناکەوێتـــــە تیرەگـــــی شـــەوگاری دڵ
دەردی وام دیــوە کــە دەرمــانی لــە کــن عیســاش نــەبوو
عاقیبــەت چــابوو لــە ســایەی ســێبەری ســەرداری دڵ
وەی خوداوەنــدا ئەگــەر دەرمـــانی وەک هــی وا نــەبا
ناهومێـــدی چـــۆن دەکەوتــە گــوڵۆشـــەی ئاســاری دڵ
گوڵ نەبێ و بولبول نەبێ ساقی نەبێ و مەی بێ مەزە
کــوا جیلــوە و جریــوەی تــێ دەزێ گــوڵزاری دڵ
تــا مەترســێ تــا ئــەوین مــابێ و کــچ و لێــوی قەڵــەم
نەخشـــی ناحـــەز نایەتـــە ســـەر قاقـــەز و پـــەرگاری دڵ
غــەیری نێــو لۆتکــەی غــەزەل «ئاســۆ» پــەنایی دی نییــە
ئــەو دەمــەی غــەم مــەوج ئەخاتــە بــەحری بێلێــواری دڵ

سنە ۱۳۹۲/۷/۹











# هەمیسان پووشپەڕ

سەرکوتی کەن هەستی هەر کەس فێری بێعاری دەبێ
دەرد ئەگەر دەرمان کرێ کوا دەردی کەس کاری دەبێ

تا دەبینم چاوێ تامەزرۆی نیگای چاوی ئەوین
گڕ لە هەستم بەر دەبێ و کانی غەزەل جاری دەبێ

لەم وڵاتە گەر ئەوین زیندانی بێ هەستی نەکەن
جێگە شمشێری زمان کوا هێندە ئازاری هەیە

خۆزگە بەو ئامێزە وا بۆ خۆشەویستی ئاوەڵان
خۆزگە بەو چاوەی لەگەڵ دڵ فێری هاوکاری دەبێ

چاو دەبینێ و دڵ دەناڵێ و حەیفە بەندی بێ زمان
گەر زمان ئازاد نەبێ گەل تووشی بێزاری دەبێ

دەردێ سەختە گەر زمان گوفتی دڵت لێ تێک بدات
پیاو لەگەڵ خۆی ڕاست نەکا کوا فێری دڵداری دەبێ

قەت مەترسێ لەو شەتاوەی ڕوو بە دەریای دڵ دەچێ
دڵ هەتا ئاشق نەبێ کوا هەستی ڕۆباری دەبێ

باسی نامەردی و هەزاردەنگی حەسوودان هەر مەکەن
یان مەچۆ نێو شاری ماران یانە مار ژاری دەبێ

وا هەمیسان مەوجی تاوی پووشپەڕە و خوێن هاتە کوڵ
تینەکەی هێند سەختە تا کورد مابێ ئاساری دەبێ

هێند بە ئاسانی هەموو شت بۆ دەڵێی «ئاسۆ»! مەکە
حەنجەرەش وەک لوولە وایە لازمەی خاری دەبێ

بۆکان ١٣٨٨/٤/٢٢









## خەون

وردە وردە خەونـــەکانم بـــۆنی ڕاســـتی لێـــوە دێ

شـەو دەڵێـی دوا سـاتەکانیە و وا سـەلاّی چارشـێوە دێ

داخەکـەم میـوەی تەمـەن لـەم باخـەدا دەنکـی نـەما

ڕووڕەشـی بـۆ بـاغی پـاییز دەنگـی خێـوی لێـوە دێ

چۆم بـووە مزگـەوتی ماسـی و دارەکـانیش چـاو لـە نـاو

ڕوومـەتی سیسـی چنـارم بـۆنی وەک دارسـێوە دێ

مەیکەشـان کـۆڕ بـن لـە ژێـر سایەی درەختـی بـێ گـەلاّ

گـوێ گـرن وا دەنگـی ئـازادی لـە نێـو ئـەم نێـوە دێ

نوێژکـەران ڕیـز بـن لـە سـەر بـەرماڵی مزگـەوتی دلاّ

بـانگی ئـازادی کـە بـدرێ قامـەتیش بـەم شـێوە دێ

کێ دەڵێ مەعشووق دەبێ یادێ لە ئاشق هەر نەکات

ئـەی پەیاپـەی ئـەم پەیامانـە لـە خزمـەت کێـوە دێ

کـوانێ تـەقوا بەرگـە دەگرێ تـاکوو چـاوی جـوان هـەبێ

کـێ یـە ناترسـێ لـە تیـرێ لـەو برۆئـەنگێوە دێ

چـاوی تـۆ بـا میقنەعـەش داپۆشـێ هـەر دەڕفێنـێ دڵ

دڵـڕفێنتـر ئـەو نیگایانـەن لـە بـن چارشـێوە دێ

گەرچی «ئاسۆ» پیر بووە و مووی سەر ڕەشانگی تیا نەما

تـا ڕەشـی نـەڕوا شـەفەق کـوا ڕەنگـی سـووری پێـوە دێ

سارۆقامیش ١٣٩٢/٦/٢٩









## خۆزگه بێ به بێباڵ

تـــا تەمـــەن سـەرتر دەچـێ هەسـتی ئـەوین منـداڵتـرە
تـــاکوو دڵ گەشـــتر دەبـێ دوو چـاوی ئیشـتیا کـاڵتـرە
چـۆم هـەتا مزگـەوتی ماسـی بـێ و گـوڵیش قیبلـەی نـوێژ
باڵ بە ئەستۆم ڕاست دەکات سوهراب کـە دەشـت بـەرماڵتـرە
لای خـودا هەرکـەس کـە خـۆی ناسـی قوبـووڵی دەرکەیـە
لای عەبـد تـــا تێگەیشـتوو بـێ بەشـەر خوێنتـاڵتـرە
ئـەو کەسـەی جێژوانـی بـن بـەژنی چنـارێکی هەیـە
لـەو ڕەییسـە خوێرییـەی ئێسـتاکە خـۆش‌ئیقبـاڵتـرە
پێت بڵـێم کـام لێـوە ئایـەی حـەق دروست مـەعنا دەکـات
ئـەو کەسـەی لێـوی لـە سـەر حـەقوێـژی سـوور و ئـاڵتـرە
ئـەو خەتیبـەی ڕاسـت نییـە و خێـزێ لـە کەوشـیدا هەیـە
زۆر لـــە تاوانبـــاری کـــن قـــازی زمـــانی لاڵتـــرە
ئـەی گوڵاڵـەی سـوور و ئـاڵ و جـوان خـۆش‌ڕەنـگ و لـەتیف
حـوکمی جـوانی تـۆ بـە سـەر شـیعری ئـەوین‌دا زاڵتـرە
بـەس نییـە عەشـق و ئـەوین بـاڵی چـەپ و ڕاسـتی نییـە
ڕاسـت و چـەپ هـەوتای یـەکن خۆزگـەم بـەوەی بـێباڵتـرە
لادە لـەم دەسـتوورە «ناسـۆ» فەلسـەفە هـەر بـۆ سـەفە
ئـەو کەسـەی وشـک و تـەڕی لا وەک یەکـە قـرژاڵتـرە

بانە ١٣٩٢/٥/٥






# له خانەباغی عەزیز ئەمیری

دەشت و جادە و کێو و ڕێگەی بەردەزەرد شین بۆتەوە
ئەو کەژەی جاران سپی یەکدەس بوو ڕەنگین بۆتەوە
چاوی کانی وا چەلان بۆ چۆڕی ئاو چەرموو ببوو
ئێستە وەک دوو چاوی عاشق پڕ لە ئەسرین بۆتەوە
لالە بەو گونچکەی گرانی عاشیرەی وات لێ دەکات
نێو دڵی داغە و دەڵێی سەرگۆپکی ئاورین بۆتەوە
هەر دەڵێی خوێنی شەهیدی بێسەروشوێنی گەلە
ڕاست لە سەر جەرگی برینداری ئەوان شین بۆتەوە
قەت کرۆجەم[1] وا نەدیبوو نزم و ڕەش لەم گۆشەوە
تێر لە سەیری جادەکەی لای ماڵی نەسرین بۆتەوە
حەیفە لەم سەر حەوز و ماڵ و خانەباغەی کاعەزیز
جامێ وەرنەگری هەتا ساقی لە سەر قین بۆتەوە
من بڵێم شیعرێک بە یادی کاتی لاوی و لاوەتیم
جا دەبینی چۆن فەتاح[2] ئیحساسی پڕتین بۆتەوە
زاربەخەندە و لێو لەسەر جامی ئەلەستی مەستی مەست
غەرقی مەعنای شیعری دووپەهلوو و ئەمادین بۆتەوە
جومعەکەم چوو، چاوەکەم خێڵ بوو حەمەش هەر دەرنەکەوت
بۆیە «ئاسۆ» وەک عەجەم دەستی لە دوو دین بۆتەوە

بەردەزەرد، ۱۳۹۰/۲/۹

---

[1] کێوێکە لە نێوان ئاواییەکانی ئەحمەداوا و دەرزیوەلی و بەردەزەردی بۆکان
[2] مەبەست کاک فەتاح دادخای هاواڵـە





# دڵبەرێکی شێتە دونیا

جاری وایە دڵ دەناڵێ دڵبەرە ئاگای نییە

جاری وایە دڵبەریش دێ، دڵ سەری سەودای نییە

دڵبەرێکی شێتە دونیا چاوەڕێ چیت لێی هەیە؟

جاری وایە قەندی هەن هەر لەودەمەیدا چای نییە

بۆ دڵۆپی ئاوی باران زۆر وڵاتن چاوەڕێ

لەوسەری دونیاش لە بەر سێلاو کەسی ڕێگای نییە

لابە سۆفی کەم بکە باسی بەهەشت و شەکر و شیر

چۆن بەهەشت دەکڕی بە ڕۆژوو خوا سەری سەودای نییە

تۆ گەدای بەر دەرکی یار بە جا دەزانی ئەو دەمەی

یار کە دەرکی کردەوە کەس ئارەزووی لای شای نییە

ئەوکەسەی دەستی لەنێو دەستانی یار بێ کوا خەمی

وای بە حاڵی زاری ئەو بەدبەختە گەر جێگای نییە

سەختە ژینی ئەو قوماریازەی کە دۆڕا ڕۆی شەوێ

داری تۆڵەی سازە بۆ ئەوشۆکە ئەمما پای نییە

تاڵی زولفی یار بەسە بۆ بەستنی دەستی ڕەقیب

زاڵی زنجیر بە دەست قەت زولفی وا تاتای نییە

گەر تروسکەی چاوەکانی دەرکەوێ «ئاسۆ» ئەدی

ترسی عازاب و گومانی پردەکەی ئەولای نییە

بۆکان ۱۳۹۰/۲/۱۵









# خەتی سەر ڕوومەت

دەسخەتێ کەوتۆتە سەفحەی ڕوومەتم نایناسمەوە
شکڵ و شێوەی دەنگی هەن تێکەڵ بە دەنگی خاسمەوە

نەسخ و سولس و چینی و لاتین و عیبریم دیتبوو
ئەم خەتەم بۆ قەت نەدیبوو وا بە گۆنای ڕاسمەوە

ئەم خەتە هین هیچ زمانێ نین و گشت کەس تێی‌دەگەن
هەر دەڵێی جێی توولەمارە وا بە ڕێی ئیحساسمەوە

شەرتە ئیدی وەحشەتی ئەم خەتتە نەحسەی نەمگرێ
من لە مانای کەس نەترسێنم لە دەنگ و باسمەوە

عاشقی پێویستی پێست و دەربەسی مووی ڕەش نییە
خۆ دەزانم گیر دەکەم ڕۆژێ بە دەست ئیخلاسمەوە

بۆ دەبێ لەم باغەدا وا پێکوڵی زۆرتر هەیە
هەر شەرابی خۆشەویستی بێتە ناو گێلاسمەوە

دوازدە مانگە چاوەڕێم بۆ جووت‌شەشێ لەم نەردەدا
تا نەکوژرێم نایە، هەر مردم بە دەستی تاسمەوە

شاد بەوەم ڕووناکە «ئاسۆ»م عاقیبەت داهاتووان
دێن بە هاواری هەناسەی ئەم گەلە پێخواسمەوە

مەهاباد — بۆکان ٩٠/٢/٢٧





# پیرە تاران

مـن دەزانـم نێـو دڵـی بـەردیش کـەمێ ئـاوی هەیـە
شەمشـەمەکوێرەش لـە تـاریکی کـەمێ چـاوی هەیـە
خۆزگـە بێ بـەو دارچنـارەی ڕاسـت و پـاک و بێگـرێ
ڕووی لـە ئاسـمانە و ڕفیقـیش بنجـێ لاولاوی هەیـە
ئـەو کەسـەی مـاڵی بـە کـۆڵی خۆوەیـە ئاسـوودەیە
وەک سەمەد قوڵ بوو کەسێ کوا ترسـی سێلاوی هەیـە
ئەو کەسەش قەتقەت بە هاوەڵ مەگرە هاودەردت نەبێ
دۆست نییە ئەو شەخسـە وا هـەر ئارەزووی خـاوی هەیـە
چـاو بپـارێزە لـە تیشـکی جـازیبی بـن زولفـی یـار
دانەدانـەی ئاڵقەکـەی وەک ڕاوچیـان داوی هەیـە
شێو و وەردم کرد شـەقامی فـاتمی و تـۆم هـەر نـەدی
پیرەتـارانیش لـە بـۆ خۆشـی فەقـەت نـاوی هەیـە
شێری ئـەم شـارە لـە برسـانا پەراسـووی دیـارە گشـت
خێڵـی ڕێویشـی لـە تێـری دایمـە بـەرماوی هەیـە
مـانگی چـاردە لێـرە دایـم دیلـی داوی دووکەڵـە
خۆم فیدای ئاسمانی کـورد بـم بـەس نییـە سـاوی هەیـە
خۆزگـە بەو لاوەی لـە نێـو مەیـدانی مینـیش بێتـرس
فـەرقی بـۆ ناکـا لـە بـەر دڵ دایمـە شـەوڕاوی هەیـە
شیعری «ئاسۆ» چونکـە دەردی خـۆی و گەلیـە چاوەکـەم
عەسـری نـوێترخوازەکـانیش دایمـە هـەر بـاوی هەیـە




تاران ١٣٩٢/٣/٢٨





## بۆ حوسەینی مامڕۆستەمی[1]

شیعرەکەی مامڕۆستەمیم کاتێ بە هەستێ زارەوە
خوێندەوە قرچا دڵم بەو شیعرە جەوهەردارەوە

کاکە تۆ شیعرت لە بۆ من دانەنا؟ بۆ پێت نەدام؟
تۆ سەری پاشای غەزەل کێ پێی کوتی بیشارەوە؟

چۆن دەبێ بۆ یەک چەلیش بێ چاو لە شیعرێکت نەکەم
بیدەمە بەر چاوی دیقەقەت جوان لە سێ چوار بارەوە

شەرتە وام حاڵی دەکردی غەش لە شیعرتدا نەبێ
تاکوو ببیە شاعیری گەل بەم هەموو ئازارەوە

من هەتا هەم خاکی بەر پێی شاعیرانی پێشترم
هەر ئەوەش کردمیە خۆڵ و وام بە سەر هەر دارەوە

شاعیری ئەورۆکە بابم زۆر حەسوودن وا مەبە
هەڵوەدا ماون بە دەستی سەبکەکەی ئەغیارەوە

خۆ لەوانیش نیت ئەدی بۆ یەک چەلیش ئەمنت نەدی
بتکەمە وەستای غەزەل لەو سەری قەڵای سەردارەوە

شاعیری وەک تۆ دەبێ زۆرتر لە نێو گەلدا بژی
شیعرەکەی زۆرتر «حەسەن»[2] بیڵێ بە نەغمە و تارەوە

لێم نەتۆرێی بەم گلە و گازندەیەی ئەمنی هەژار

---

[1] حوسەینی مام ڕوستەمی شاعیرێکی زۆر باشی بۆکانیە. غەزەلێکی بۆ من کوتبوو بەڵام من هەر نەمدیت تا چاپ کرا. ئەتیش منی نەدی. ئەم غەزەلەم وەک نامە بۆ نووسی.

[2] گۆرانی «سەرزەڵی کاک «حەسەن دەرزی شیعری ئەم کاک حوسەینەیە.





دڵپــڕم خێڵــی حەســوود نامیــان بــە کــوورەی نــارەوە
ئــەم کتێبــە وردەڵانــە نابنــە دەرمــان بــۆ گــەلت
شــیعرەکانت کــۆ کــەوە یەکســەر بــە ڕاســت و خــوارەوە
مامــە هــێمن پاشــی ٥٢ خــولی ژیــن چــاپی کــرد
تــاوەکوو حــافز چــووە ئاســمان نەهاتــە خــوارەوە
نا برام! مامڕۆستەمی قــەتقــەت ئــەوان دۆســتت نــەبوون
دۆســتی تــۆ «ئاســۆ»یــە کاکــە بــەو دڵــەی غــەمبارەوە











## ناهومێدی




وردەوردە باخەڵی ژین بێ هەناسەی گوڵ دەبێ
بولبولی ئاشق تەرەی لێوی خوناوەی چڵ دەبێ
ئەو گوڵەی جاران ترووسکەی کوڵمی وەک پشکۆ دەچوو
داخەکەم ئێستا لە ژێر تۆزی تەمەندا شل دەبێ
قەت مەچۆ ناو حاڵی ئەو یارانە وا سارد و سڕن
چونکە هەر گۆشەی دڵی پڕسۆزە بۆ مەنزڵ دەبێ
پاکترین واژەی پەسەند لەم عەسرەدا پووڵ و پلەن
بۆیە سەربالی پەپوولەش پڕ پەڵە و پۆخڵ دەبێ
یەک دوو ساڵ پێش ئینقیلابیش تا بە ئەمڕۆ چاوەڕێم
هەر نەهات ئەو مەڵهەمەی وا بۆ برینی دڵ دەبێ
هەر درۆ بوو، هەر ڕیا بوو، هەر جنێو بوو، هەر قسە
قوڕ بە سەر ئاشق کە وا هەر ژێر دەسەی عاقڵ دەبێ
کوا لە کوێی ئەی شاپەری ئاسمانی شیعری ئاشقیم
بەدری مانای شیعرەکانی من بە تۆ کامڵ دەبێ
گەرچی خۆناسینە سەرحەددی مەداری ئاقڵی
خۆپەرەستی بێ گیانە دەستنوێژی دڵت باتڵ دەبێ
تاکوو هەی هەر گوڵپەرەست بە و خاکی خۆتت خۆش بوێ
کاکە «ئاسۆ» چۆن بەشەر دوشمن بە خاک و گڵ دەبێ؟

بۆکان ٩٢/٥/١٨





# لە سەر گڵكۆی بابە




باوە گیان وا هاتمە سەر قەبران و دەنگی تۆم نەبیست
زۆر سڵاوم كرد و هەرگیز یەک جەوابی خۆم نەبیست
ئێستەكەش بانەمەڕە و هاتوومە سەر گڵكۆت كەچی
هیچ هەواڵێكم لە پیری و شیر و جام و چۆم نەبیست
دەوری منداڵیم هەتا لاویم لە باوشی ئێوەدا
هێندە ئاشنا ڕابرا قەتقەت وشەی نامۆم نەبیست
چاوی هەر چاوبازێ بانگی چاوی كردم چوومە لای
گشت پەنایان دام لە هیچیان قەت مەكە و لاچۆم نەبیست
ئێستە مووی ڕەنگی كفن وای بۆز و ناحەز كردووم
چوومە سەرچۆپیش لە داوانێک خشەی یەک دۆم نەبیست
لایەلایەی خۆشەویستی وای خنی بوو گوێچكەكەم
من بە پیریش غەیری سۆز ئاهەنگی شین و ڕۆم نەبیست
جەژنی ئەمساڵ كۆچی ئازیزان وەهای تاڵ كرد لە من
لەو قەناتانەش بە غەیری شینی كاک «شێركۆ»[1]م نەبیست
چوومە سەر گۆیژەش بە شاباڵی غەمی ئەو شاعیرە
چەندە بیری «ناسرم»[2] كردبوو لەویش لالۆم نەبیست
فەیسبووک و ماڵپەڕ و یوتیووب نەما گوێ شل نەكەم
غەیری شیعری تازە قاڵب كۆنەكەی «ئاسۆ»م نەبیست

سارۆقامیش، جەژنی ڕەمەزانی٩٢

---

[1]. مەبەست شاعیری گەورە كاک شێركۆ بێكەسە

[2]. مەبەست كاک ناسری ڕەزازیە





## نامە

بیستبووم کوتیان نەخۆشی دەردی من زۆر زۆرترە
کێ لە نامەی شاعیرانەی عاشقێ خەمخۆرترە؟
سەد پەڕۆی شینم لە شان دروا لە سەر وەسڵی ئەوین
گەرچی ئەم وەسڵەم لەوانەی دیکە زۆر ناجۆرترە
ئەو کەسە کۆستی کەوێ وا تۆی لە من کرد بێ خەبەر
ئاوی عیشقی تۆم لەوانەی دیکە یەکجار شۆرترە
ڕۆژبەڕۆژ تینووترم چۆڕێکی دیم بۆ تێکەوە
چون قەباڵەی عیشقی تۆم پڕشاهید و پڕمۆرترە
کەی قەرار وابوو منی مەجنوون بە بێ لەیلا بژیم
شانسی من ئەم زامە چی بوو ڕۆژبەڕۆژ ناسۆرترە
ئەو هەوەسبازانە وا ڕەشبین و ڕەشبیرن کەسم
هیچ کە جێی متمانە نین دڵیان لە بیریان بۆرترە
هەر منم شیعرم لە ڕاستیدا دڕاوە کڵاوەکەی
ڕووی دژانیشم لەوەی قەزوێن گەلێ پاشۆرترە
ژین لەوەش بێتینترە تاوێ کە «ئاسۆ»ت ڕوون کەوە
چون گلۆڵەی ژین لە لێژی پیرییا خللۆرترە

بۆکان ڕەشەمەی ٩١









## حەڤدەهەمین فستیواڵی گەلاوێژ

هەمیسان ئاگری حەسرەت لە داخی تیپی بێهەستان
وەکوو بەردی ڕیا تەققەی لە شووشەی وسکوتم هەستان
ئەوەی عەقڵی لە چاوپایە نەشە و دڵخۆش و پڕفامە
ئەوەی عەقڵی لە مێشکایە سەری لێی گێژە وەک مەستان
ئەوەی وا خاوەنی بەهرە و ئەوین و سۆزە بێدەنگە
ئەوەی ئەهلی ڕیا و خوارین مەقامیان وا لەسەر دەستان
خودایا چەن گوناحن ئەو کەسانەی تالیبی حەقن
کە دەبینن لە باتڵ شۆر و شادی و سەروەرن پەستان
ئەرێ ئەی ئاشنایان ئەی ئەویندارانی ئەم خاکە
بە قەد ئەهلی ڕیا خێرتان لە زانین دیوە یەک کەستان؟
ئەرێ کامتان لەبەر پووڵ و پلە کڕنۆش و سوژدەو برد
ئەرێ کامتان لە بەر دەرکی تەواغیت لەحزەیەک وێستان؟
کەچی ئائەم ڕیاکارانە هەر ڕۆژ ڕەنگێ دەنوێنن
بە ڕاستی ئەم نەزانانە لە فێڵ و تەفرەدا وەستان
ئەوا لەم فستیواڵەشدا شیعر هەر سووک و بێقەدرە
لە هیچ کوێ ڕێگەیان نادەن ئەوانەی وا لە نێو شەستان
ئەوا چاوی ڕەشی «ئاسۆ» وەها کاڵ بۆتەوە دیسان
بە دڵیا نایێ چارێکیش بکا لەو تیپی چاوەمستان




سولەیمانی، ٢٠١٣/١١/٧



## زمستان مو

بیا که تلخکام نقش‌های پیریم ای دختر

در گلدان شعرم ببال و همچنان تر و شاداب

تکرار کن پاییز را

و بهار را

به زمستان مو منگر

که این حدیث ناآشنایی است

تو را

و عشق را

در روان قطرانیش خنده‌ام میگرفت از آسیابان طبیعت

و اکنون منم آن زمستان موی ژولیده احساس

که خلوت تو را بی چتر عاطفه

زیر سرپناه باران می‌طلبم

و چه بیهوده است این میقات

و چه دیرهنگام این دیدار!

بدرود ای لحظات خوب عاشقی

بدرود ای بهار حُسن

زیرا که عشق در سرزمین من بیوه‌ای است

که سالها است فراموش کرده است

هم‌آغوشی را!

بوکان، ۹۲/۲/۲۸



## هەستی شاعیری

کاتێ هەستی شاعیریت بەندە بە دەست و پاتەوە
کاتێ شمشاڵی گەرووت بینی خەفەت دەخواتەوە
کاتێ گوڵ ویشک و خەزانی و مات و بێشەوق و کزە
بولبولی خنکاوی دووکەڵ خەونی خەم دەبیاتەوە
کاتێ هاژەی بای شەماڵ نایێ و ڕەشی بای مەینەتی
تۆزی ترس و ڕەنج و فەقری کرد بە سەر سیماتەوە
تۆ تەمایاری چ خدرێکی وە فریامان کەوێ
حاکمێ عەدڵی نەبێ ڕەببی خودا بیباتەوە
شادمانی بۆتە سیمورغ و لە دوندی کێوی قاف
غەیری تیپی گوێلەمستان جوابی کەس ناداتەوە
بۆ دەوێری پەیکێ هەڵباوی و بە ئازادی بڵێ
ئەو سپیسوارەی دڕۆزن لا لە کەس ناکاتەوە
خوایە گەر گۆشەی سەرابێک و دڵۆپێ مەی نەبا
کێهە کەس نەشئەی دەما بەم هەمووە کیش و ماتەوە
جا کەسێکیش بێت و عومری هەڵکشابێ بۆ سەرێ
هیچ کەسێ لای خوارەوەش تۆزقاڵێ جێی ناکاتەوە
وەی کە یارەب چی بەسەر هات ئەم وڵاتە جوانەمان
چی بنووسێ ئیدی «ئاسۆ» بەم هەموو ئاواتەوە

بۆکان ٩٢/٤/٥



## بۆ ئەردۆغان

هێنده بێڕەحمانە مەدوێ کوانێ شەڕ باوی هەیە
ئەو کەژ و کێوانە مەکوتە دار و بەرد چاوی هەیە

کێوی قەندیل گەمیەکەی نووحی لە سەر نا ئەو دەمە
ئێستە کوانێ وەحشەتی چەند داری سووتاوی هەیە

ئەو کەسەی دار و نەداری وا بە کۆڵی خۆیەوە
کوانێ ترسی ئاگر و تۆفان و سێلاوی هەیە

کەی لە مەرگ و ژینی کورتی خۆی دەترسێ ئەوکەسەی
گەر لە بۆ ئەستاندنی حەق ئارەزووی ڕاوی هەیە

نانی با تێدا نەبێ خۆ گەرمە تەندووری خەبات
ژینی کورتیشی هەبێ قەیناکە خۆ ناوی هەیە

پێی بڵێن خاڵۆمەلاش هیوای بە نوێژی شەو نەبێ
چون بە ڕۆژی روون لەبەر فێڵ نوێژی فەوتاوی هەیە

کوا بە ئەسپی ئاسنین «ئاسۆ»! کەژی کورد تەخت ئەبێ
ئەو کەسەی دوژمن بە کوردە ئارەزووی خاوی هەیە



نەورۆز

١٩٩



سنە ٩٠/٥/٣١





# سەفەر و زەرەر

خۆزگە بەو لاوە گراوێی لە ڕەفیقانی سەرە
چش لەوەی دەردی ئەوین عاقیبەتی دەردیسەرە
گوتم ئەی بولبولی بێچارە درووی زۆرترە گوڵ
گوتی چ بکەم بە خودا خۆی دەڵێ پێم زووکە وەرە
جا ئەگەر عاشقێ مەعشووقێ پەنای بێ چ غەمی
گەر لە سەر ڕیشی بهارێن دڕەکانی تەگەرە
سەفەری کورتە ژیان حەیفە بڕەنجێنی دڵێ
محەکی باش و خراپی بەشەریش هەر سەفەرە
سەد ڕکات نوێژی ڕیا قیمەتی پووشێکە بەڵام
بەخودی کابە بڕەنجێنی دڵێکی خەتەرە
چییە قازانجی ژیان غەیری نیگای چاوی ئەوین
ئەو کەسەی ئەشقی نەبێ ژینی هەمووی بێسەمەرە
لێی گەڕێ تاقمێ شەڕیانە لە سەر خواردنی یەک
کەسێ خۆخۆر بێ یەقین گورگە لە پێستی بەشەرە
کردەوەی پێ دەوێ هەر واژە لە زار دێتە دەرێ
شەخسی بێ کردەوە چەشنی قەڵەمی بێئەسەرە
بەشەری وا هەیە ساتێکی لە قیمەت نایە
بەشەری واش هەیە وەک گردەملی سەر چەپەرە
کەیفی خۆتە بە جگەرگۆشەیی شیعرم چ دەڵێی
لە عولوومی نەزەری هەر نەزەرێکیش نەزەرە
وەکوو «ئاسۆ» بە لە ژین خاکی و هاواڵی هەژار
ئەو کەسەی خاکی فرۆشت دوایێ دەزانێ زەرەرە




بۆکان ٩٠/٤/١٢





## مێرگی خاشخاشە

چاو لە هەر شوێنێ دەکەی دەردێکی تازەی پێوەیە
دەرکی ئاواتیش دووسەد قوفڵ و قەرازەی پێوەیە
هەر من و تۆ و حەقتەعالا بووین کە ماچم کرد دەمت
ئێستە هەرچی شیعرە بۆنی ئەو نیازەی پێوەیە
ناحەقی کرد شێخ کوتی قەت چاو لە چاوی جوان مەکەن
ڕووی سپی بێ ئەو کەسەی ئەو چاوە بازەی پێوەیە
لێی گەڕێ یەزدان دەزانێ کامە کێو بەفری دەوێ
بۆیە پێیدا چاوی جوان ئەو غەنج و نازەی پێوەیە
ڕازی ماچێک ڕاگرە خاک زۆر دەمی قورسە و گران
کێو کە وا بێدەنگە زۆر لەو باس و ڕازەی پێوەیە
بانەمەڕ قەندیل دەبێتە مێرگی خاشخاشەی شەهید
ئێستە بەم هاوینە هێشتا سەد جەنازەی پێوەیە
ئاوپەرەستی و تاوپەرەستی و گوڵپەرەستیم بیستووە
خاکپەرەستی دەرد و ژانی بێئەنازەی پێوەیە
دەفتەری ئەشعاری «ئاسۆ»م دوێشەوێ چاو لێ دەکرد
غوربەتیم هەستا کە دیم ئەم شیعرە تازەی پێوەیە

بۆکان۲۸/۵/۹۰







# پیری و مەعرەکەگیری

ژین بە لەز دێت و دەچێت و شلە هێزی دڵەکەم
چاوی من کزتر ئەبێ و سوورترە لێوی گوڵەکەم
سەد شوکور خوایە ئەوا دیم گوڕوگاڵی نەوەشم
سەوزە وەک چاوی «دیار»م کەژ و کۆی نێو دڵەکەم
پیری و مەعرەکەگیری کە دەڵێن نەسلی قەدیم
بە نیگای چاوێ من ئەو فەلسەفەیەی باتڵ ئەکەم
کوشت و کوشتاری نییە جەنگی دڵ و گوڵ ئەخەوان
هەر بە مەستی دەکرێ باسی گوڵی سەرچڵەکەم
یۆسفی میسری؟ لە نێو چاڵی ئەوینی زلەخای!
وەکوو مورسی مەکە مە! زار بە دوعای قاتڵەکەم
ئەو و کۆنەی نییە ئۆخژەنی چپەی لێوی ئەوین
دڵی پیرم بە چپەی ماچی کچێ کامڵ ئەکەم
من لە مەیدانی ئەوین شێری وەهام کردووە ڕام
زولفەقار نووکی زمانمە و قەڵەمیش دوڵدوڵەکەم
داری دڵداری فەقەت شێتیە میوە و سەمەری
ئەوە مەجنوونە دەفەرمێ لە عەقڵ من سڵ ئەکەم
خاڵ بە خاڵی خەتی شیعرم خەمی ڕازێکە ئەگەر
ئاشکرا بێ خەمە بۆ دەفتەرە بێحاسڵەکەم
گوڵ و باڵندەیە هێمای غەزەلی «ئاسۆ» کەسم
گولوبالیزە فیدای سونبول و پۆڕی شڵ ئەکەم



ساروقامیش ١٤/٤/٩٢





## جۆزەردان

مانگی جۆزەردان ئەوا هات وا بە زەردی جۆیەوە
پێخەکەی خۆی دادڕیوە گوڵ بە ڕەنگ و بۆیەوە
زەردی دەردی ئاشقی گەر نیشتە سەر ڕووی مووی سیات
لێی گەڕێ با لێی بنیشێ قەت نەچی بیشۆیەوە
ژین قەتارێکی نەوەستە ئیست و بیلەعەکسی نییە
ئەو سەری گەرمە بە دوێنێکە و سبە و ئەوڕۆیەوە
دوێکە ڕۆیشت و سبەی نازانی چۆنە چاوەکەم
بێ ترس ئەوڕۆ بژی و بیدە لە تان و پۆیەوە
شەربەتێ تاڵە ئەجەل ساقی ئەزەل تێی کردووە
جا بە پیری یا بە لاوی هەر دەبێ بیخۆیەوە
داوەتی شاهی گوڵان بێ و بولبولیش قامێژەکەی
خوا بە تاوانی دەنووسێ نەچیە دەستی دۆیەوە
ئەی گوڵی لاولاوی پیریم تۆم هەبی قەت نابەزم
باغی گوڵ ناچم بە شەوقی شەشپەڕ و شەوبۆیەوە
چاوی تۆم مەیخانەیە زولفت دەڵێی ڕێحانەیە
بەژنەکەت سەوڵی خەرامانە بە دوو لیمۆیەوە
تا شلەی پشتوێندی تۆم بێ قەت بە ژین نادەم شلی
گەر تەنانیش بێتە ئەستۆم بەو قەف و لۆلۆیەوە
چوومە جێژوانی فریشتەی شیعری تەڕ «ئاسۆ» کوتی
لێرە بوو هەور و هەلای هێنا و لە ترسان ڕۆیەوە

مەهاباد،٧٨/٣/٨





# تۆ مامۆستای منی

شەرتە تا مانم لە ژیندا بێ ئەوین و گوڵ نەبم
عاقڵی گەر بێدڵی بێ، شەرتە قەت عاقڵ نەبم
یارەبی چاوم بە ڕووی جواندا نەبێ قەت هەڵنەیێت
شەرتە ئیدی باغەوانی باغی بێحاسڵ نەبم
ڕووت گوڵ و زوڵفت وەنەوشە و دوو هەناری نەورەسیش
خوا بکا لەو باغ و گوڵزارەت وە بێ مەنزڵ نەبم
یەک بە یەک گوفتە و قسەی چاو و بزەت بزوێنەرن
حەیفە بۆ مەدحی ئەوانەت شاعیرێ کامڵ نەبم
نا ئەمن ئوستادی تۆ نیم تۆی کە مامۆستای منی
بمکە شاگردی ئەوینت با ئەوند غافڵ نەبم
قەت نەبوو جارێ بە دڵ سفرەی دڵم ئاواڵە کەم
وەحشەتی تانە و تەشەر دێڵێ ئەوندە سڵ نەبم؟
ئاوی عیشقی من لە کانی عیشق و شەیدایی درا
ئیدی چۆن بۆ ڕووی گوڵی تۆ بولبولی سەرچڵ نەبم؟
دێتە یادت ئەو دەمەی چاو و زمان بو دووبەدوو
هاوتەمەن نین قەیدی ناکا، حەیفە گەر هاودڵ نەبم
ڕاوی چاو و داوی زوڵفت چۆلەکەی ئیحساسی گرت
چۆن لەگەرمی تاوی عیشقت وەک جەرەی نێو گڵ نەبم
یادی چاو و ناوتە شیعرێ بە «ئاسۆ» خەلق ئاکات
جا بە چی مەعلووم لە سەر وەش تووشی سەد موشکڵ نەبم

مەهاباد، ٢/٤/٧٨











# ئەختەری پووشپەڕ

ڕاستە وەرزی گوڵ کەم و کورتە وەفاشی هەر نییە
هاودەمی خۆشە لەگەڵ بولبول بەڵام تا سەر نییە
ئەختەری هێمن کە فیشەکدانی کردە گەردەنی
شیعری پێشکەش کەی دەبێ خۆ هەر کچێ ئەختەر نییە
من زمانی سوێسنە و هێرۆ و گەزیزەم خوێندووە
هیچ کەسێ دەرسی گوڵانی هێندی من ئەزبەر نییە
داخەکەم ڕەمزی وەفاداری لە گوڵزار ون بووە
حەقیە بولبول لێی بتۆرێ عاشقە خۆ شایەر نییە
جێی برینی تیغی بوختان زۆر درەنگ سارێژ دەبێ
هەر برینێکت کە دی خۆ جێی دەمی نەشتەر نییە
هاوزمانی خۆشە ئەمما داخەکەم بۆ هاودەمێ
گەر سەری سەودات هەبێ هیچ بەرگرێ لەمپەڕ نییە
هەر گوڵێ بەردڵ نییە هەر ڕەنگی سووریش گوڵ نییە
هەر سەرێکیش لەم جیهانە لایەقی ئەفسەر نییە
تا بەرزتر بی ولاتێ زۆرترت لێ دیار دەبێ
کوچکەڕەش پیرۆزە ئەمما قەت بەقەد ئاویەر نییە
من سەرم سووڕما لە بەرزی دەرکی دووکانی قوفوڵ
مەوجی مانگی پووشپەڕە هی گێژی ئەسکەندەر نییە
زۆری وا هەن جووت دەکەن واژە و بە شیعری ناو دەبەن
دیارە «ئاسۆ» هەر شتێ دەریایی بێ گەوهەر نییە

سنە ٨٧/٤/٢٤

نەورۆز
٢٠٥





# پلار

لــە ســەرم‌دایــە هــەوای هەڵبەســتێ

ســۆبەئاســایی گــڕی لــێ هەســتێ

ڕازی دڵ نامــــەوێ دەرخــــەم بــــەخودا

مــاڵی چــاو شــێوێ تکــەی ناوەســتێ

وەرە هــــاوڕێی غەمەکــەم بــا بگــرین

کــوا بــە تــەنیایی تەقــەی دێ دەســتێ

کێ دەڵــێ دەرکی بــەهار داخــە لــە چاو

کــێ عــەیب دەگــرێ لــە کاری مەســتێ

دڵنیــام مــن نییــە تــاوانی کەســێک

تــوێژ بــەرەو قیبلــەی ئــەوین دابەســتێ

غــەم مــەخۆ کاکــە بــە گوفتــەی ناکــەس

کــوا دەبــی ســووک بــە پــلاری پەســتێ

تــاوەکوو کەعبــەیی دڵ قیبلــەت بــێ

ســەد بــەناو حــاجی بــە تــۆ ناوەســتێ

بۆیــە «ئاســۆ» دڵــی پڕخوێنــە لــە ژیــن

بێــزی لــەو هــەمووە ڕیــا هەڵدەســتێ

بۆکان، هاوینی ٨٧











# لە حەوشەی سەعدیە

تا لە حەوشەی ماڵی سەعدی ئەم هەموو جوانانە بێت
کەس نەکا مەنعم ئەگەر واژەم هەمووی شێتانە بێت
عاشقی و شێتی بە وێنەی دوو براڵەی دائیمین
فەرموو ئەی عاقڵ بە یەک شێت تۆ بفەرموو وا نەبێت
کێ دڵی دێ سەروەت و ماڵی فیدای ماچێ بکات؟
هەر کەسێ عاشق بێ دەیکا جا مەگەر سەودا نەبێت
شیعری تۆ کرمان و شیراز و سپاهانی تەنی
سەیر نییە شەیدای شعووری شیعری تۆ لای بانە بێت
پیری حەفتا سالە جوونی مێکنە فەرمووتە خۆت
ناحەقی مەگرە هەتا پەیغامێ لەو چاوانە بێت
پیری من بێستان و گوڵزارن وتەت هێند دڵگوشان
سەوزی عەرزی حەوشەکەت یەکسەر بەقەد عاسمانە بێت
هەر فریشتە و حۆریە دێن و دەچن لەم باغەدا
مالکیش ئاورم بدات بۆ حەسرەتی رزوانەبێت
ئەی سەراپا شیعر و عەشق و شاعیری و شەیدایەتی
سیلە چاوێکت لە تەبعی شێتی ئەم بۆکانە بێت
تا بە ودمی هیممەتت «ئاسۆ» غەزەل وا ڕوون بکات
دانەدانەی میسرەعی شانازی ئەم کوردانە بێت

شیراز، ۹۲/۱۲/۱٤











# له حافزیه

تۆ کێی که قسه‌ت کرده هه‌تاو، نووره که‌لامت
من کێم؟ که به گریانه‌وه هاتوومه سه‌لامت
نامناسی، من ئه‌و شێته ئه‌ویندارەیی کوردم
عاشق به قسه‌ی فارسی ئه‌تۆ و ڕه‌مزی په‌یامت
هاتوومه‌ته سه‌ر توربه‌تی پاکت بکه هیممه‌ت
تا ده‌رکی بکه‌م هه‌ست و وشه و سۆز و که‌لامت
کێ پێی کوتی ڕه‌ندانی هه‌موو عاله‌مه شه‌یدات
ئه‌ی خۆم به فیدای ڕه‌بتی قسه و باده و جامت
تۆ چوویته تروپکی لقی سدره و له عه‌رشدا
قودسی به هومایوونی ده‌ڵێن شیعر و مه‌قامت
هه‌ر قومرییه ناڵانه له سه‌ر داری مه‌زارت
هه‌ر بولبوله شه‌یدایه له به‌ر سیحری که‌لامت
ئه‌و نه‌شمیله چاوکاڵه ده‌بینی له په‌ناسدا
چۆن ده‌گری له بۆ فه‌لسه‌فه‌که‌ی چه‌شنی خه‌یامت
خۆی لێوی ده‌ڵێی باده‌یه فرمێسکی وه‌کوو دوڕ
ده‌ڕژێته سه‌ر ئه‌م مه‌رقه‌ده ئه‌ی کوانێ قیامت؟!
هه‌سته وه‌ره ئه‌م گۆڕه گه‌ڵێ چووکه‌یه بۆ تۆ
بشکێنه به ئه‌م میسره‌عه سه‌وتی ده‌ر و بامت
دل در بر و می بر کف و معشوقه به کام است
«ئاسۆ» به فیدای شیعری نه‌شه‌ی جه‌ژنی سیامت

شیراز، حافزییه ۹۲/۱۲/۱۲









## در شیراز در اندوه حلبچه

تا رخ با نمک گل‌نظران را نگرم
بزند شور سرود غزلی خود به سرم
این چه خاکی است که تا چشم برآن روشن شد
غیر زیبایی و شیدایی نیامد نظرم
هر تماشا غزلی است ز دیوان نگاه
بهر درک نگهی گوش و سر و پا بصرم
شور سعدی به سر و رندی حافظ به دلم
این دو پهلو کند و وان تر و تازه اثرم
من اگر بهر غم فاجعه‌ای آمده‌ام
خاک شیراز فرستد به فضایی دگرم
چون شبانکاره به شب همچو ستاره اشکم
در غم شهر شهیدم همه اختر نشمرم
کُردم و نیست به جز عشق وطن در دل من
تا بود قند سخن شکّر شیرین نخرم
بیستون گر به من آموخت ره فرهادی
عشق شیراز نماید خجل از هر شِکرم
افق رنج حلبچه به قلم گریه کند
تا که یاد آورم از کفتر بی‌بال و پرم

شیراز، ۹۲/۱۲/۱۱





## زرِبرا

گەر لە شوعلەی نێونیگا دوور بم هەناسەم سڕ دەبێ
مەیلەکەت تا سارد ئەبینم قەلبی گەرمم پڕ دەبێ
گوێ مەدە ساردی هەناسەم کامە عاشق پێک گەیین؟
هەوری دووری تا نەدا چەخماخە کوا پڕگڕ دەبێ؟
کۆن و تازەی بۆ نییە وەک شیعرە عاشقبوون کەسم
بێوەفایی باعیسە چارشێوی عەشقت شڕ دەبێ
تۆ دەڵەی دەستم شکا لەم ڕێی ئەوینە، من دڵم
دەست و پێی ناوێ بەڵێ، خێڵی گورگ زگدڕ دەبێ
دیوتە زاروو چۆن لەخوێن تێر نابێ، تێر بوو خل دەبێ
لێی گەڕێ ئەو زاڵمەش عاقیبەتی هەر مڕ دەبێ
تاوەکوو مەنعم دەکەن لەم عەشق و سۆزەی نیشتمان
زۆرترم عەشق و ئەوین و حەز لە دڵدا خڕ دەبێ
کورد هەتا سەر وا بووە هەر ژێر چەپۆکەی خۆییە
چاوەکەم مێژووی چەواشە کوانێ بۆ ئاوڕ دەبێ
ئەو کەسەی ترسی هەبوو پەنجانی بشکێنن سەرێ
ئێستە خۆی ئاڵا دەسووتێنێ، برا هێند زڕ دەبێ؟!
کێ پەسەندی کرد لە نێو شیعر و سیاسەت وەرگەڕان
ئەو کەسەی زۆر توندە «ئاسۆ»! دیارە زووتر کڕ دەبێ

سەقز، ۸۸/۵/۱۱









## یادی یەڵدا

مـاڵی شـیعریش قسـەیە باسـی دڵـم بەرمـە ئـەوێ
قەت بووە ویشکی دڵ ئـەورۆ تـەڕی شیعریشـی نـەوێ
هێنـــدە بێـــزاری ژیـــانی دڵەڕاوکـــەی ســـتەمم
شیعر و عەشقم لەپەنای یەک بەمەسـەل بوونـە هـەوێ
چاوی سەر چرکەبژێر بـوو کـە چـەلان چـاوی دەدیـت
ئێســتەکە چـاوی دڵیشـم لـە نیگـای هەڵدەکـەوێ
داخەکـەم ڕەمـزی گـوڵ و بولبـولی ون کـردووە دڵ
وەک سەعات وایە کە قورمیشی نەکـەی زوو دەخـەوێ
کـــۆکی دڵ ســـرتەیێ قاچاخیـــە لای یـــارەوە دێ
دەردی سـەد کورتەپـەیامی لـە دووسـەد نامـە کـەوێ
تــۆ بــەڵێنی شــەوی یەڵــدایێکی دیـم پـێ بـدەوە
عەهـد ئەکـەم بـاخی بەهەشـتم بـدەنێ هـەر نەمـەوێ
ناسکی لێوی ئـەتۆم گـرت بـە قـەدەر سـوورە گـوڵێ
گوڵ لە شەرمان شەبەقی سوبحی لەلا بوو بـە شـەوێ
تیپـی گـوڵ پـاکی لەگـەڵ نەرگسـی شـەهلا هـاتن
دڵـی مـن هیچـی وەبـەر دڵ نەکـەوت گیانـە لـەوێ
بەربـەیان بولبـولی گـوڵزاری عـەرش بـوو دەیکـوت
دڵـی «ئاسـۆ» لـە گـوڵا هـەر گـوڵی لاولاوی دەوێ

بۆکان ٦/١٠/٨٧





# دیدار

سەبرێ وەرە با خەڵکی بە ئەم ڕازە نەزانێ
چاو فەرشی بەری پێتە قەدەم سووک لەوێ دانێ
حەوت ساڵە کە وا تەبعی تەڕم ویشکە لە دووریت
ڕوونی کەوە یا شیعرێ بە ئەم وەسڵەتە دانێ
ڕۆییشتی و نەتزانی لە دووت چۆنە دڵی من
پرسیم لە شنۆ و بانە لە سەردەشت و لە خانێ
دەمزانی گوڵم فەسڵی بەهار دێتەوە باوان
نەمزانی ئەگەر بەم چلە بۆم دێتە ژووانێ
یاڕەب بە حوسەینت قەسەم ئەورۆکە کە شیعە
خۆی بۆ دەکوژێ و پاکی دەکەن سینەکوتانێ
لەم ڕۆژە پشوودا گوڵی من هاتەوە باوان
زستان و مەحەڕڕەم ئەوە لێم بوو بە گوڵانێ
من پیرم و تۆ لاوی دەمی زەوق و سەفاتە
هەستی گوڵی نێو باغتە دەمکاتە جەوانێ
یەکیەک لە سەرم موویی سپی ڕەنگی ڕەشۆ بێ
ڕووی ڕەش بێ ئەوەی قەدری ئەویندار نەزانێ
«ئاسۆ» کە ئەوین ڕێبەری ڕێی شیعر و قەڵەمیە
ماندووش کە دەبێ هەر بە ئەوین دەگرێ وچانێ

بۆکان ۸۷/۱۰/۱۷











## مەودا

حاسڵی ئەم عەشق و چاولێکردن و یەکویستنە
بوونە چەن شیعر و ئەمەش دەسکەوت و سەرمایەی منە
داخەکەم تا چاو ئەمەی زانی دروست چاو لێ بکات
داری لاوی بەرگ و باری هەڵوەری و نەیما شنە
کێ لە زریانی خەفەت پەنجەی تەزیبێ تێدەگات
گەرمەتاوی هێزی ئەژنۆ پەنجە لێک توندکردنە
تۆ بە تیغی تیژی ئەبرۆت داتدڕی پەردەی حیجاب
بەسیە قاچاخی ئەوین کەی عەسری تیر هاویشتنە
کێ دەڵێ حەووا فریوی خوارد و ئادەم دەرکرا
قیبلەی ئاوات و یەکەم فێرکاری هەر پیاوێ ژنە
بۆ دەبێ ئاواتی دڵ لەو نێو بەهەشتەشدا نەبێ
جا ئەگەر وا بێ لەوێش هەر شوێنی ئازادی ونە
ئەی بەیانم دەرکەوە با تێر بکەم سەیرانی ڕووت
شەو هەتا سەر هەر نییە ئاخری وەجاخی ڕۆشنە
ژانی شەوگاری ڕەشە تێیدا دەزێ کۆرپەی بەیان
چەشنی لێوت گوڵ دەپشکوون خێرە ئەم پشکووتنە
ڕۆح کە نێزیک بێ لە یەک مەودا و سنوور ڕێگر نییە
دێنە کن یەک فاسیلەی سەردەشت و سابلاغ و سنە
ئەی شنەی سروەی سەحەر جارێکە «ئاسۆ»ت ڕوون کەوە
تا بە تیشکت ڕوون بکەی هەرچی دەوار و قوژبنە

بۆکان ٨٧/٨/١٥





## چاوپشکووتن

ئـاگرێ هـەڵ بـوو لـە نێـو دڵ بـێ نـوور و نـەوت
وا لەسـەر کـەیکی تەمـەن هـەڵ بـوو شـەمی پەنجاوحـەوت
مووم سپی، دەست چرچ و چاو بێهێز و پشتیش پڕ لە ئێش
هـەر بـە تـەنیا ئـەو دڵـەم منداڵـە بـۆم نـاکرێ زەوت
هـۆ چـرای ژیـن و هومێـدان ئـەی ئـەوین تـۆم پیـر نـەبی
خـۆم فیـدای نـووری نیگـای جوانیپەرەسـتی سـەرڕەوت
ئـەی گـوڵی سـووری لـە نێـو بـەفری سـپی شـوکری خـودات
تـۆم هـەبی هـەر بیسـت ئـەبم قەسـتەم بـە نـازی ئەمشـەوت
بـاغی سـینەت پـارکی شـادی شـیعر و دڵـداری منـە
چـاوی تـۆم قیبلـەی مـورادە و دەرکـی ئێـوەم مزگـەوت
ڕاسـتە چـەن بـەیتی شـەلن دەسـکەوتی ئـەم پەنجاوشەشـەم
زەردەلیمـۆت تیشـکی ڕێـم بـێ کـێ شـتی وای دەس کـەوت
شـادمانیم نووسـتبوو هەسـتا بـە دەنگـی نـەرمی تـۆ
خـەم هـەتا سـینەی سـپی تـۆی دی خـرپ تێیـدا خـەوت
لـێم گـەڕێن ئـەی ڕەخنـەگر کـەم باسـی ڕۆژاوا بکـە
کێـودڕێش نـادەم بـە پـاریس و بـە مۆسـکۆ و وەرشـەوت
یـا لـە مینـای لێـو شـەرابێ یـان لـە شووشـەی گـەردنت
چـاوەڕێی ئیحسـانە «ئاسـۆ» جـا لـەمت بـێ یـان لـەوت!

بۆکان ۹۲/۳/۹



نەورۆز
۲۱۴





## بۆنی بەهار

دەڵێن بۆنی بەهاری دێ ڕەبی گوێی دار و بەرد کەڕ بێ
لە ژێر خاک دێتە دەر لالە عەرز گەر بەردی مەڕمەڕ بێ

کە گرماندی هەور گرتی بناری دڵتەڕی ئاسۆ
هەموو کەس چاوەڕێیە لێوی ویشکی نەوگوڵان تەڕ بێ

نەچی گەر داوەتی گوڵ بوو بە پیری گۆشەیەک بگری
بچۆ لای دەستی سەرچۆپی ئەگەر هەر تاقە یەک گەڕ بێ

دەزانی بۆچی پەیتووکە لە پاییز ماڵ بە ماڵ دەڕوا؟
ئەویش گوڵ بوو لەوە پێشتر ڕەبی پاییز.بەختشەڕ بێ

بە ئەو بێهێزییەی فەرمووی بە شیلان و بە گوڵباخی
دڵی یەکتر مەئێشێنن دەبا سەد هێندە سەگوەڕ بێ

تەمەن پاکی بەشی یەک عاشقی ناکا کەسی کاکی
دەبێ بۆچی ئەتۆ بۆ تاک و پاکی خاکی خۆت زەڕ بێ؟

لە مەیدانی عەمەڵدا گەر لە فیکری خەزز و بەزدا بێ
بە کار نایەی ئەوی ڕاکات دەبێ هێندێ کز و لەڕ بێ

بەرەو «ئاسۆ» کە هەڵدەفڕی لە تەپکە و تەختە مەحفووزی
لە حەڵقەی تەپکەدا گیرە مەلێ بێ باڵ و بێ پەڕ بێ

ساروقامیش ٩٢/٢/٢٢





# راه و رسم عشق

تـا نروبـی بـه مـژه خـاک در خانـه‌ی عشـق
نشـوی لایـق یـک بوسـه‌ی جانانـه‌ی عشـق
تو شبی تا به سحر چشم به ره بـاش و مخـواب
صـبحدم یـار شـوی بـا دل فرزانـه‌ی عشـق
رهــزن حـرص و طمـع بـاش و میـازار دلـی
تا شوی سالک و هـم طالـب مردانـه‌ی عشـق
ای کـه در نـاز و تـنعّم پَـیِ دیـدار دلـی
خـارج از بـاغ نـدارد ره کاشـانه‌ی عشـق
لذّت مسـتی و معشـوق کسـی خـوب چشـید
سـر نتابیـد ز پیمـودن پیمانـه‌ی عشـق
راه اگـر یافـت بـه کاشـانه‌ی دل نـور نگـاه
جای ده! آمده همچـون پـری از لانـه‌ی عشـق
پیـردل گشـته جـوان از هـوس آن نگهـت
تـا ابـد زنـده بـود حـسّ مریدانـه‌ی عشـق
بـر فکـن مقنعـه و بـاز نمـا خـرمن مـوت
زلـف آشـفته مرتـب شـود از شـانه‌ی عشـق
آه از این حسن خداداد کـه گـل یافتـه اسـت
هر صـبا میشـود آکنـده ز دُردانـنه‌ی عشـق
هرکـه از موهبـت جـام تـو سرمسـت نشـد
همچو «ئاسـو» نشـود شـاعر رندانـه‌ی عشـق

غار قوری قلعه، ۹۲/۲/۲۹





## سۆنامی ئەوین

قـەت نـەبوو سـاتێ دڵـم خـاڵی لـە دەردی کۆنـە بـێ

دەردی تازە هەر هەیـە جـا ئیـدی هـی کـۆن بـۆ نـەبێ

عیشــقە تۆفــانی بــەپا کــردووە تەنیویــە دەوروبــەر

چۆن لە سۆنامی نەخنکێی جـا مەگـەر دڵ سـۆ نـەبێ

دەردی بێ چاری گەل و عیشق و خـەمی نـان و سـتەم

قــەت بــووە یــەکیان لەوانــە بـۆ دڵـم نـامۆ نـەبێ؟

سـاقیا بـۆم تێکـە تـا ئـەو کاتـە چـاو ڕەنگـی دەبـێ

لێم گـەڕێ لـەم دەورەدا بـا دەوری هەشتێ و نـۆ نـەبێ

نان و دۆ وا بوونـە پـەردەی چـاوی جـوانبینـی خـەڵک

من دەڵێم یا خوا لە شاییش دەستی نـەرمی دۆ نـەبێ

داخەکەم لـەم خاکـەدا عیشـق و سیاسـەت هـەر یەکـە

قەت بووە حەتتا بە شیعریش ئیزنـی گفـتوگـۆ نـەبێ

کـێ دەڵـێ پیـری و زەلیلـی هاوکلاسـی یـەک نـەبوون

مـن کەسـم بـە پیـاو نـەزانی و نەیبەزانـدم تـۆ نـەبێ

شـیعری تۆیــە وا گرێــی دڵ بــاز ئـەکا چاوبازەکـەم

هیچ کەست هاوتـا نییـە لـەم چەرخـەدا «ئاسـۆ» نـەبێ

بۆکان، ڕەشەمەی ٩١







# نەکەم چ بکەم؟

کە تۆ ڕۆیشتی جێت هێشتم ئەمن هەر شین نەکەم چ بکەم؟
لەڕووی تاڵەی ڕەشم نامەی عەمەل ڕەنگین نەکەم چ بکەم؟
ئەوەندە کاڵ و منداڵی ئەوینی تۆم لە پەنجادا
لە حوجرەی عەشقتا ئەمشەو کەمێ تەمرین نەکەم چ بکەم؟
بە دڵتەنگی لە فرمێسکم درووست کەم جەوهەرێ ڕۆشن
لە نووسینی بە دووڕەنگی ئەگەر نەفرین نەکەم چ بکەم؟
قەڵەمڕەنگینەکان ئەمڕۆ دەمێ سوور و دەمێ شینن
لە حەیفی وان ئەگەر تەرکی قسە و نووسین نەکەم چ بکەم؟
گەزیزەم کەوتە بەر سەرمای چلەی بێڕەحمی زستانی
ئەگەر شینی شنەی شەوبۆ و گوڵ و نەسرین نەکەم چ بکەم؟
بەهارە و تازە کوێستانی سەرم خاڵخاڵی ناچێتۆ
لە حەیفی پاییزی پیری پەلەی هاوین نەکەم چ بکەم؟
هەتا خوێن نەڕژێ لەم خاکە وڵامی ویستی کەس نادەن
بە فرمێسکی دڵی خوێنم وشەم خوێنین نەکەم چ بکەم؟
گوڵی سوورم لە بەر تۆیە ئەگەر فەرهادی دەورانم
بە چێژەی عەشقی ئەم خاکە قسەم شیرین نەکەم چ بکەم؟
فیدای ئەو خاکە بێ «ئاسۆ» کە تۆی پەروەردە کرد بۆ من
دڵم بۆ خۆشەویستی گەل ئەگەر پڕتین نەکەم چ بکەم؟

بۆکان، بەهاری ٨٥



## بۆ کاک «دیار»ی نەوەم

وا هەمیسان کەوتمەوە یادی بزەی لێوی دیار

لەم وڵاتی غوربەتە لەم شوێنە وا وەک لالەزار

سەوز و زەرد و لێرەواری پێنجوێن وەک پەرچەمە

وەک قژ و چاوی دیارم غەمڕەوێنە و شادیوار

تا دەبینم کۆرپەیەک یەک ساڵە دڵ وەک غونچە گوڵ

وەرزی پشکۆتنیەتی پاییز بێ زستان یان بەهار

بابەکەی بابم بە چاوی تۆ قەسەم زۆر دڵپڕم

لەو وڵاتەی گەر دەکەن سووکی بە شیعری مام هەژار

بێت و لەم وەرزی خەمە دەرچم ئەدی شەرت بێ بە دڵ

نەچمە خاکێ پێنەزان بگرێ لە زانا بەرد و دار

میللەتێ گەر دۆست و دوژمن چەشنی یەک بێنێتە ڕیز

حەیفە یەک دوو شەو زیاتر پیاو لەوێ بگرێ ستار

وام لە ناڵپارێز و یادی ناڵەشکێنەمە

یادی بۆکان و دیارم چاو دەکاتە ئابشار

دوێنێ ئێوارە لە ئاویەر[1] تاو چووە جێژوانی شەو

بەربەیان هەڵهات لە بۆکان و لە کەرکووک ڕۆیە خوار

شەمسی تەبرێزی زەمانە بابەکەم باپیری تۆ

---

[1]. شەوی پێشتر لە سنە بووم هاتمەوە. سوبحانەم لە بۆکان خوارد و بەرەو هەولێر وەڕێ کەوتم. ئێوارە گەیشتمە کەرکووک و شەوێ لە هەولێر خەوتم.





داخەکـــەم زانـــین بـــووە پێشـــێلی ناسیاســـەتمەدار

مـــن ئەگـــەر شـیعرم نەبایـــە چـــی دەبـــوو دەس مایەکـــەم

گەرچی بەهرەی هەر نەدا بۆ من ئەبەد شـیعر و شـیعار

دڵنیـــام ڕۆژێ دەبـــێ قـــەدری دەگیـــرێ شـــیعری مـــن

قەت لە باخچەی شیعری «ئاسۆ» ناحەزی نـاگرێ قـەرار

هەولێر، هوتێل وڵات، ٢٠١٣/١١/٢











# . فەرهەنگۆک .

(زۆربەی ئەم وشانەی لێرەدا هاتوون مانای تریشیان هەیە، لێرەدا ئاماژە بەو مانایە کراوە کە لە شێعرەکەدا مەبەست بووە)

ئاوەز: کێم کۆ بوون لە زام و برینەدا

ئاوسەرکەمی: هاوسەرکەمی؛ کەمایەسی، کەمبوود

ئەغیار: بێگانە

ئیستنساخ: لە روو نووسینەوە، نوسخە لێ هەڵگرتنەوە

بابەگورگور: کانگەیەکی نەوتە لە باشووری کوردستان، لە شاری کەرکووک

بارەتۆر: کەوی یەکساڵەی نەگیراو

بای سەبوون: بای زۆر گەرم

بوغز: رق و قین

بەدر: مانگی چاردە، مانگی پڕ

بەدەو: جوانچاک، ئەسپی خۆشبەز

بەردەباز: ئەو ریزە بەردەی لە ناو چەمدا بەسەریاندا دەپەڕنەوە

بەردەزەرد: چیایەکی لە نزیک بۆکان، شاخەوان موقبیل هونەرپەژووهـ لە رەوەزێکی ئەو شاخەوە هەڵدێرا و هەر لەسەر ئەو شاخەش نێژراوە.

بەروێ: بەرۆک

بەیار: زەمینی نەکێڵراو، بوورە

بێدەمار: بێفێز

پرینگانەوە: سڵەمینەوە، سڵە لێ کردن

پلەوبەردە: گۆماوێکە لە نزیک ئاوایی ساروقامیش

پۆڕ: باڵندەیەکی لە مریشک زلترە (دُرّاج)

پەلکە: کەزی، پرچ

پەپتووکە: جۆرێ چۆلەکەی بچووکی تیژباڵ

پێکوڵ: دڕکێکی سێ سووچە گیایەکەی بە زەویدا پان دەبێتەوە

پێسیر: یەخە، بەرۆک

تاڵە: ئەسمەری مەیلەو رەش

تامەزرۆ: زۆر بەتاسە

تراو: روون

تورپەت: گڵکۆ، مەزار

تۆرەمە: نەژاد، رەچەڵەک

تەپکە: داوی راوەمەل

تەپلە: کڵاوی لباد

تەتە: زنجیرە چیایەکە لە هەورامان دەکەوێتە نێوان مەریوان و پاوە





تەرلان: مەلێکی ڕاوکەرە

تەرە: ئاوارە

تەگەرە: کۆسپ و لەمپەر

تەنین: دەنگ دانەوە، تەنینەوە

تەوار: مێچکەی باز، بازی مێوینە

جەردە: دز و ڕێگر

جەز: گەنمی سوورکراوی سەر خەرمان

جەیب: باغەڵ

چارداخ: کۆخی ناو مەزرا

چەقەنە: دەنگ دەرهێنان بە لێکدانی قامکە گەورە و قامکی زەڕنەقووتە.



چەرمەوو: سپی

چەلەنگ: شۆخ و شەنگ

حەیتە: ئەندامی نێرینەی پیاو

خۆڵەپوت: خۆڵەمێش

خوناوە: شەونم، دڵۆپە بارانی زۆر ورد

خەرمانلۆغە: شیرینی خەرمان سوور بوون

خەس: خەست

خەش ڕژان: داخ ڕژان، داخ لە دڵدا نەمان

دڵەڕاوکە: دوودڵی، نیگەرانی

دەسنیا: چانراو، نانەوە (دار)

ڕسکان: ڕووان و هەڵچوون

ڕۆچنە: کونی ماڵ بۆ ڕووناکایی

ڕەحیماوا: گەڕەکێکی کوردنشینی کەرکووکە

ڕەشانگ: عەرزی بەفر لێ نەماو، تۆپەنێک لە زەوی کە بەفرەکەی تواوەتەوە

ڕەوت: جۆری ڕۆیشتن

ڕەوڕەوە: ئامرازێکە بۆ یاریدەدانی منداڵ بۆ پێ‌هەڵگرتن

+ زەل: قامیش

ژەرەژ: کەو

ستار گرتن: ئارام گرتن

سرک: قوشقی، ڕەوەک

سزبە: زۆپا، کوورە

سۆدرە: برێتی لە خەڵکی سادە

سۆنە: نێرەمراوی سەرسەوز

سوێسکە: سووسک، سویسکە، باڵدارێکە

سیخوار: زوقم، خووسار

سیوادە: برێتی لە خەڵکی سادە





شای‌مەردان: چیایەکە لە باشووری ناوایی ساروقامیش

شل: ڕەنگی سووری کاڵی پنۆکچنوک

بە کلک شەن کردن: بزنتی لە کەیف ساز بوون

شمشدەر: شەش لا، جیگەی کایەی مۆرەی شەش خاڵ لە نەردیندا

شەقار بەستن: فەلەشین، دادران

شیبا: سووکەبای شەوانە

غەنج: ناز و کرشمە

غیلمان: کوری جوانکیلەی بەحەشتی

شەن کردن: هەڵاوێشتن و بە با دانی خەرمان

فیس: تەقیلە و کلاوی قووچی سوور

قاشە ماسی: قەشە، جۆری ماسی زار گەورەی گۆشتخۆشە

قریوە: هەراوهۆریا لە خۆشیان

قلیچقایە: چیایەکە نزیک ناوایی ساروقامیش

قەرابە: دەفری گەورەی ئارەق و شەراب

قەدپاڵ: گەوە، ناوەڕاستی چیا

قەقنەس: باڵندەیەکی خەیاڵی دەنگخۆشە گۆیا دوای تەمەنێکی درێژ چرپی و چاڵ کۆ دەکاتەوە، دەخوێنێ و باڵ لێک دەدا تا ئاگر دەکاتەوە و خۆشی تێدا دەسووتێ.

قەیرە: کچی گەراوە

قوڵ بوون: قوڵت بوون، نابوود بوون و هیچ پێنەمان

قەڵەم کردن: پەڕاندن (لاق)

کر: نەخش

کڕ: بێدەنگ

کرژ: بەنی توند بادراو

کڕ: کۆگای سووری خرمان

کوڵ: نووک پەڕیو، زبر

کۆلارە: بادەوەی کاغەزی، تەیارەی کاغەزی

کۆلکە: قەدیم بە دەفتەری تۆماری ناو و نیشان دەگوترا

کەشار: ئاو لە زەوی نان بۆ ئاوەنیا، زەوی ئاو دان بەر لە جووت کردن

کەشمەکەش: کێشە و هەرا

کەلی کورتەک: چیایەکە لە باشووری کوردستان

کەوبوار: ڕێگەی گەرمێن کوێستان کردنی کەو

کەو کردن: سەرەند کردن و دابێژتن (کەو ئامرازێکی بێژنگئاسای کونکونە بۆ دابێژتنی دانەوێڵە کەڵکی لێ وەردەگیرێ)

گڕ: زبر، کول

گراوی: یار

گردەمل: هێسقانی ئەستۆ، پێشەی مل

گۆلکە: گۆلاری بچووک





گەس: تامێک کە زار کۆ دەکاتەوە، وەک تامی میوەی کاڵ

لاتیل: تەماشا کردن بە گۆشەی چاو

لانەراز: نازشێواو

لز: تاڵ (بەن)

لزلز: چین لەسەر چین، توێتوێ

لەمپەر: کۆسپ

لەنگیزە: قوروچڵپاوی بارانی زۆر

مارانگاز: مارگەستوو

ملک و ماش: دارایی

مزز کردن: توند ڕا کردن

مەغموون: زیان دیتە لە سەودا

مەشکەی گاوس: مەشکەی دروستکراو لە پێستی گا

مێژوەرد: گیایەکە لەوەڕێکی خۆشی ئاژەڵانە

مێلاک کردن: زەواد کردن، لێ خواردن

ناسۆر: برینی تەشەناکردوو

نەقارە: جۆرە تەپڵێکە بە دوو دار لێدەدرێ

وار: جێگە ژیانی هاوینان لە ئێلاخ، هاوینەهەوار

وەشت: نەرمەبارانی بە کزەباوە

هیبوت: دابەزین، هاتنە خوار

هۆز: جەواڵی زۆر گەورەی یەکتایی

هەرزاڵ: جێگەی کەل و پەل لەسەردانان لە ڕەشماڵ و لە ناوماڵدا

هەڵبواردن: خۆ لێ لادان، سرنج پێ نەدان (خەت هەڵبواردن: لادان لەسەر ڕێچکەی خۆ)

هەیاران: ئەی دۆستان!

هێڵ: خەت

